


العقيدة في ضوء الكتاب والسنة ٦

القضاء والقدر

الدكتور عمر سليمان الأشقر



# قەزاوقەدەر

وەرگێرانی

ئارامی گەلالی

بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تەفسیر - هەولێر




بیروباوەر لەبەر روشنایی
قورئان وسوننەتدا

# قەزاوقەدەر

نووسینی
د. عومەر سلیمان ئەشقەر

وەرگێرانی
ئارامی گەلالی

پێداچوونەوەی
نەوا محمد سعید

لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر / هەولێر

زنجیرەی: بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا
ناوی کتێب بە عارەبی: القضاء والقدر
ناوی نوسەر: دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر
نۆرەی چاپ: سێیەم
ساڵی چاپ: ١٤١١ك - ١٩٩١ز
ناوی کتێب بەکوردی: قەزا و قەدەر
ناوی وەرگێڕ: ئارامی گەلاڵی
پێداچونەوەی وەرگێڕان: نەوا محمد سعید
ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان
پیتچنین: نوسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ١٤٢٢ك ٢٠٠١ز
چاپکردن: ئۆفسێتی هەولێر
تیراژ: ١٥٠٠
ژمارەی سپاردن: ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە ، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپێزترو پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کەگەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێوی‌و داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی رەهاکرد، باڵی بەزەیی‌و دادگەری بەسەر جیهاندا راهێلاو سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاری‌و کوشت وبڕو تالان و بڕۆ و بەرهەڵدایی‌و بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەری‌و رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاری‌و خۆشی‌و دادو رێزو هێمنی‌و خۆشگوزەرانی‌و ئازادی‌و سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامیەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانی‌و خراپەکاری‌و ناخۆشی‌و ستەم و بێهودەیی‌و نیگەرانی‌و تاڵگەردی‌و ژێر دەستەیی‌و کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامیەوە بەرپادەبێ، چونکە هەمویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندی‌ناس و هزری کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانەو وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیاتنان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی ، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانی‌و سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ

دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شـوفێنیزمی ئـەوروپا نـەبو کـە دوجـەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی ؟!، ئەدی هـەر بیروبـاوەڕە شـەیتانیەکان نیـە کـە وای کـردوە هـەمو رۆژی بۆمبـای ئـەتۆمیو هایدرۆجینیو نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتیو زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنـەوەی دادگـەری لەسەرتاسـەری جیـهاندا؛ بـەهۆی بزاڤێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێو لـەقورئان و سـوننەت هـەڵێنجرا بـێ، ئەگـەر نـا هــەر وێرانــی لـەناو وێرانــی بـەرپادەبێو مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکارو دڵڕەق و بێبـەزەییو وێرانکاریش بـێ، سـەرلەبەری کیـانی ئـەم مرۆڤــە دەگۆڕێـت، گۆڕانێـك هــەمو لایەنــەکانی بگرێتــەوە، چونکـە بیروبـاوەڕی ئیسـلامی چارەسـەرو ئامۆژەکـانی بـۆ رەگ و ریشـاڵی مرۆڤـە، هـزرو ئاوەزو دەرونـی رێکدەخاتـەوەو تـەپ و تـۆزی شـەیتان و هەوەســت و خۆپەرسـتی لەسـەر دەرونــی لادەدات و پـاکی دەکاتـەوە، ئـەمجار رێوشـوێنێکی راسـتاڵی بـۆ رادەنوێنــێو پێــی دەڵــێ فـەرمو ئەمــەش ژیـانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یـان لەهـەر گۆشـە نیگایەکـەوە تێی روانیبـێو خزمـەتێکی پێشـکەش کردبـێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەردو دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ هەڵبەت کــارێکی گـــەورەی ئـــەنجام داوەو خزمەتەکـــەی بەشـــێکە لـــەم رزگاربونـــە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەودالـە. دیـارە ئـەم زنجیرەیـەی کـە دکتۆر عومەر سلێمان الأشقر نوسیویەتیو ناوی ناوە ((العقيدة في ضوء الكتـــاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کـە متمانـەی کردۆتـە

ـەر سەرچاوەو ژێـدەرە ڕەسـەنەکانی بیروبـاوەڕو بیروبـاوەڕە پوکـەڵ و لاڕێو ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی ڕاگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەڕانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادەو ڕێکوپێـك و زانسـتیانەی بـەکارهێناوە بەتایبـەتی لەپەرتوکـەکانی دواییـدا، نـاوەڕۆکی پەرتوکەکـەش پـتر ئایــەت و فــەرمودەو دەقــی زانــا بــەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی ڕۆشن کردۆتەوە.

ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسـەریش لـە نوسـراوەکانیاندا ئاماژەیـان بـۆ کـردوە تـا موسـڵمانان بـەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایـەوە، کـە ئەمـەش بەڵگەیـە بـۆ چـاکیو سـودی ئـەم زنجیرەیـە، بـەم پێودانگـە پێمـان وایـە وەرگێڕانی ئـەم زنجیرەیـە گـەلێك پێویسـت بـو بۆ ڕابونـی ئیسلامی لە کوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نـەبێ، لەبـەر گرنگـیو لەبـەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیـە، پشـت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لە وەرگێڕانەکـەدا هـەوڵمان داوە ئاسـتێکی زمانــەوانی باشــی پــێبدەین و ئیشــکالات بــۆ خوێنــەر بەجێنەهێڵین.

وا بەرهەمــەکان لەبــەردیدی خوێنەرانــەو ئــەوان دەتوانــن وەرگێڕانەکــە هەڵسـەنگێنن ، لـەخوا داواکـارین لەکارەکـەماندا سـەرکەوتوبین و توانیبمـان خزمەتێك بەم ڕابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ.

ژیوانی گەلاڵی　　　　ئارامی گەلاڵی

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾قمر ٤٩

﴿ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا ﴾الأحزاب ٣٨

**پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ**

"لايؤمن عبد حتى يؤمن بالقدر خيره وشره من الله، وحتى يعلم أن ما اصابه لم يكن ليخطئه، وما اخطأه لم يكن ليصيبه"

**ترمذی گێڕاویەتەوە**

# رشتەی بابەتان

*بەندی چوارەم*



*بەندی پێنجەم*

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆخودا کە بۆ راستەڕێ رێنوێنــی کردویـن، لـە ریـزی تاعەتکارانی داناوین و بەدینی ئیسلام رێزی لێگرتوین و بۆ بڕواهێنان رێڕونـی کردوین.

درود پێشکەش بێ بۆ دواهەمینی پەیامبەرو پێغەمبەران، ئەو پەیامبـەرەی پەیامی خودای راگەیاند و راسپاردەی بەجێ گەیاند و ئامۆژگاری نەتەوەی کرد و جیهادێکی پاك و پوختەی کرد و هەتا مردنێ ژیانەکەی وا بەڕێ کرد.

درود و سلاوی خودای پێشکەش، هـەروەها پێشکەشی خانـەوادەی چاك و پاکی، پێشکەشی یارانی رێڕوناکی.

خوێنەری بەڕێز!

ئەم پەرتوکەی وا لەبەر دەستت دایە دواهەمین پەرتوکی ئەو زنجیرەیە کەپتر لە (دە) ساڵ بەر لە ئێستا ناوی خوام لێهێنا. زۆر سوپاسی خوا دەکەم کە لە تەواوکردنی ئەم کارەدا یاریدەی دام، لێی دەپاڕێمەوە لێم قبوڵ بکات و نیازم پاك لەپێناو خۆیدا مشتوماڵ بکات و وەك چۆن لەدنیا یارمەتی دام لـە رۆژی قیامەتیشدا پاداشتم بداتەوە.

خـوا کـردی ئـەم زنجیرەیـە رەواجێکـی زۆری پـەیدا کـردو خـەڵك بەگـەرمی لەئامێزیان گرت، لەخوا دەخـوازم لێم قبوڵ بکـات و بـەچاکی خـۆی لەگـەڵمدا بکات و لەکردەوەم رازی بێو لەهەر هەڵەو هەتەرێکی کردومـە بمبورێت و هـەر کەمتەرخەمیەکم کردبێ لێم خۆش بێ، داواشم لەخوێنەران تەنها نزاو دوعـای خێرە، نزام بـۆ بکـەن خـودا لـە هەڵـەو تـرازانم خـۆش ببـێ و لـە گوناحـەکانم ببەخشێ.. ئەوە خوایە! بەڵکە بەفەڕو بەرەکەتی نزای پیاوچاکێك لێم خـۆش ببێ.

خوێنـەران لـەمێژە چاوەنواڕی پشـکوتنی ئـەم پەرتوکە دەکـەن؛ بـەڵام دیـارە

لەبەر چەند کارێك کە نەدەکرا دەسبەرداریان بم وەدرەنگ کەوت، تا خوا کردی دەرفەتێکم بۆ رەخساو پەرتوکەکەم تەواو کرد. پێشتر تەقەلاّم دا بینوسم، بەلاّم کە دەمنوسی دلّم تەنگ دەبو، بەراستی لەنوسینی بابەتێکی ئاوەهادا دەترسام کە چەندان پێنوسی لێخلیسکاوەو کەسانێکی زۆری زۆر زیرەك و بلیمەتی بەگومرِا بردوە.

ئەم بابەتە ئێستاشی لەگەلّدا بێت سەختترین هەورازو هەلّەموت بوەو کەسانێکی زۆری لێ هەلّدێراوە. گومرِاکان بەزۆری لەدەرگای قەزا و قەدەرەوە رێی گومرِایان گرتۆتەبەر. چەندین کەس هەبون خۆیان پێ بلیمەتی ئەو مەیدانە بو کەچی دەیان و سەدان جار ساتمەیان کردوەو لەپەورِو کەوتون، خۆیان بەسەرگەردانێکی بێچارەی نێو گەرداوێکی بێبن دۆزیوەتەوە.

ئیبنولقەییمی فەرەزان لەپێشەکی پەرتوکەکەیدا بەناوی (شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والتعليل) دەلّێ: ((ژیرمەندەکان لەم بابەتەدا جۆرەها رێ و کەنار و کەند و دۆلّیان گرتۆتە بەر، خۆیان خستۆتە نێو هەمو کەلێنێك و سواری چەموش و ناچەموشان بونەو ویستویانە هەرچۆنێ بۆیان برِەخسێ برِۆن و نەوەستن تا بەتەواوی بیناسن و لەهەقیقەتەکەی تێ بگەن.

نەتەوەکانی کۆن و تازە لەم بارەوە قسەو تاوتوێیەکی زۆریان کردوەو بێ وچان رێگایان برِیوە تا بەلّکو بە مەبەست و فامەکەی بگەن، هەر کۆمەلّەو بەجۆرێك بەناخی ئەم بابەتەدا شۆرِبۆتەوە، نوسەرانیش چەندین پەرتوکی جۆربەجۆریان لەبارەیەوە نوسیوە.. هەمویان ویستویانە بگەنە ناواخنی راستەقینەی ئەم بابەتە، بەلاّم هەرکامێکیان بگری دەبینی لەبەرئەوەی لەخۆرِا لەم بابەتە دواوە بۆیە لەگەلّ خۆیدا سەری لەئەرێ و نەرێیاندا گیربوەو لەگەلّ کەسانی تریشدا توشی شەرِەقسە بوەو بەهیچ گەیشتوە، هەر یەکێکیشیان قسەو بۆچونێکی هەلّبژاردوەو لەهی خۆی بترازێ هەقی لەهیچ کەسێك

نەخوێندۆتەوە، چونکە بەهیچ کام لەوانیتر رازی نەبوەو پێی وانەبوە نیشانەیان پێکابێ.

هەرهەمویان، تەنها ئەوانە نەبن کە دەستیان بەسروشی خواوە گرتوە، دەرگای رێنوێنیان لەرو داخراوەو لەراستەرێ راخزاون، خۆیان بە بێهودەیی خەریك کردوە، لەئاوێکی مەنگ و گەنیویان خواردۆتەوە، لەدەرگاکانی هزر و بیریان داوە، سەرەنجام بەخۆو بەکۆمەڵێك خواست و بۆچونی بێنرخ و قڕپۆك گەڕاونەتەوە، هەرکامێکیان بەو کەمە زانینەی لە هەگبەی دایە شاگەشکە بوەو پێی وایە رێسمانی بەئاسمان گەیاندوە! بۆیە رای ئەو کەسانەی گومانی باشی پێبردون وەپێش دەقی دروست و سروشی پەروەردگاری خستون. بەڵام گومان لەمەدا نیە کە ئەو کەسە داماوێکە داماوان زگیان پێ دەسوتێ! بەدرێژایی تەمەنی تا وا بێ و هەتا ماوە هەر تینوە، هەر خواردنەوەیەکیش ببینێ پێی وایە ئاوە. لەدورەوەڕا بانگ دەکرێ؛ بۆ رێنوێنی وەرچەرخێ! وەرە سەررێی رێنوێنی! کەچی ئەو تا مردنێ خۆی لەگێلی دەدات و بەگومڕابونەکەی دڵشادە، بڕوای بەجۆرەها ئەفسانەو ئەستەم هێناوە، ئەو بێبڕواییەی کە وا دەزانێ رێنوێنیە بۆتە لەمپەری رێنوێنبونی، بۆیە قەت ئاگاتە هەواری رێنوێنی، قسەکانی یان زمانحاڵی دەڵێ: چۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی وەبەر چاکەی خۆی خستوە؟ ئاخۆ خوا لەوان باشتر شوکرانەبژێران ناناسێ؟))[1].

بەراستی کە گوتەو باسوخواسی ئەوانەم دەخوێندەوە کە لەکۆن و نوێ بەبیری قەزاوقەدەردا شۆڕبوینەوە، قسەکەی ئیبنولقەیمم وەك مانگی چواردە بۆ رون بۆوە. پیاو هەق بڵێ هێندەی دەمکرد نەمدەوێرا بچمە ناو ئەو مەیدانە،ئێ لەلایەکی دیش حەزم دەکرد زنجیرەکە تەواو بکەم و فێرخوازێکی زۆریش پێشیان لێ دەگرتم و دەیانگوت: کەی دەردەچێ؟ کەی پێی شاد دەبین؟

---

١ شفاء العليل ص١٤.

ئـەوەبو لەئـەنجامدا بـەناوی خـوداو بەتـەمای خـودا، خـۆم لێـدا، بـەڵام بەشێنەیی‌و بەوریایی. ئەو زانایانەم کردە سەرمەشق و پێشەنگ کە گەواهی راستەرێیی و پێشەوایەتی دین و زانستیان بۆ دراوە، بۆیە گەلێك گوتەو قسەی زاناگـەلێکم راگواسـتۆتەوە، بەراددەیـەکی زۆر قسـەگەلێکی خـاوەن تـەقواو پیاوچاکانم هێناوەتەوە بەو نیازەی لارێ نەبم و لەناو پێچاوپێچی رێگەدا بزر نەبم. هەڵبەت ئایەت و فەرمودەکان مەشخەڵی رێگاکەم بون و لەبەر رۆشناییاندا هەنگاوم هەڵگرتوەو بەزانستی ئەوانەوە بەهرەمەند بوم، خوداش کۆمەکدەری بڕوادارانەو بەبێ خودا هیچ ناکرێ. تکاشم لەزانایان ئەوەیە، خلیسکانی قەڵەم راست بکەنەوە و ساتمەکانی هزر و بیر تەخت بکەن و گرفتی پەرتەوازەیی بۆچونان دەرمان بکەن.

ئەم پەرتوکە لەدوای ئەم دەسپێکەدا لەحەفت بەند پێکهاتوە:

لەبەندی یەکەمدا واجبێتی بڕوابون بەقەدەرم رون کردۆتەوە، رونم کردۆتەوە بڕوابون بەقەزاوقەدەری خودا بنەڕەتێکی بڕوابونە.

لەبەندی دوەمدا چاوێکی خێرام بە دیرۆك و مێژوی باسوخواسی قەدەر راداشتوە.

بەندی سێیەم: بەپێناسەکردنی قەدەرو رونکردنەوەی پایەکانی تەرخانە. چوارجێباسیشم بۆ هەڵناوە:

جێباسی یەکەم: بە پێناسەکردنی قەدەر تایبەتە.

جێباسی دوەم: قەزام تێدا پێناسە کردوەو پەیوەندی نێوان قەزاو قەدەریشم رون کردۆتەوە.

لەجێباسی سێیەمدا باسی پایەکانی بڕوابون بەقەدەرم کردوە کە بەبێ ئەم پایە(ارکان)انە بڕوای کەس تەواو نابێ.

جێباسی چوارەم: باسی ئەوە دەکات کە کردەوەکانی مرۆڤ لەلایەن خوداوە

قەزاو قەدەری بۆ بڕیار دراوە و بەدیهێنراوە، لەقورئان و سوننەتیشدا بەڵگەگەلێکم لەو بارەوە هێناوەتەوە.

ئەمە لەبەندی سێیەمدا، لەبەندی چوارەمیشدا رونم کردۆتەوە عەقڵی مرۆڤ تا چ مەوداو ئەندازەیەك بەقەدەری خوادا دەشکێ و پەی بەچ دەبات و پەی بەچ نابات.

بەندی پێنجەم: تایبەتە بەخستنە روی (راڕەوەکان (المذاهب) دەربارەی قەدەر)، ئەمیش بریتیە لەسێ جێباس:

لەیەکەم جێباسدا بۆچونی بێباوەڕانم خستۆتە رو کە بڕوایان بەقەدەر نیە و بۆچونەکانیانم هێناوە و گومڕاییەکانم دەرخستوە، گفتوگۆو مشتومڕی زانایانیشم هێناوەتەوە کە لەروی ئەو بێبڕوایانەدا گوتویانە. ئەو بەڵگانەشمان هێناوەتەوە کە ئەوان پێیان وایە پاساوی بۆچونەکەیان دەداتەوەو دەرمخستوە کە نەك بەڵگە بەڵکو مەڵگەش نین، بگرە چەند گومان و خەیاڵاتێکن و تروسکەی حەقیشی لێ ناپەرشێ، هەریەکێکیش بڕوادارێکی تەواو بێ دەمودەست گومانەکانی لێ دەرەوێنەوە.

دوەم جێباس بەرونکردنەوەی ئەو بۆچونەم تایبەت کردوە کە بۆتە گومڕاکردنی ئوممەت و سەبارەتی لەکارخستنی عەقڵی نەتەوەو ئیفلیجکردنی ئیرادەو بزاڤیان و وزەو توانای بەهەدەر داون و کردەوەکانیان بۆ بەرژەوەندی دوژمنانی ئیسلام وەرچەرخاوە، ئەم بۆچونەش بۆچونی قەدەرییە جەبرییەکانە کە پێیان وایە قەدەری خودا جەبرکارییەو پێویست ناکات کردەوە ئەنجام بدرێن.

رونم کردۆتەوە ئەوان لە حەفت روان گومڕا بون.

سێیەم جێباسم بۆ رونکردنەوەی بۆچونی یارانی رێبازو کۆمەڵ تەرخانەکردوە. سێ خوازگەم تێدا هەڵناوە، لەهەر خوازگەیەکدا بیروباوەڕی

نوسراوی زانایەکی سوننەتیم خستۆتە رو.

لەبەندی شەشەمدا هۆی گومڕابونی گومڕابوانم رون کردۆتەوە.

لەبەندی حەفتەم و کۆتاییشدا باسی هەندێ بەرهەم و بەروبومی بڕوابون بەقەدەرم کردوە.

لەخوا دەخوازم لە دەرخستنی ئەم بنەڕەتەی بڕوادا سەرکەوتو بوبم، هەروەها لێی دەپاڕێمەوە بەندەکانی پێ بەهرەمەند بکات.

انه نعم المولى ونعم النصير، وهو حسبي ونعم الوكيل.

دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەڕ

٢٥ی رەجەبی ١٤١٠ ك

١٩٩٠/٢/٢١ ز

# بەندی یەکەم

## بڕوابون بەقەدەر بنەڕەتێکی بڕوایە

بڕوابون بەقەدەر بنەڕەتێکی بڕوایەو ئەگەر بڕوا ئەوەی لەگەڵدا نەبێ کامڵ نابێ. عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ لەوەڵامی پرسیارەکەی جبریلدا ﷺ فەرمویەتی:

((أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله، وتؤمن بالقدر خيره وشرّه: بڕوا ئەوەیە کە بڕوات بەخواو فریشتەکان و پەرتوکە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران هەبێ، هەروەها بڕوات بەخێرو شەڕی قەدەر هەبێ.. جبریلیش گوتی ڕاستە))[1].

زۆر ئایەت و فەرموده باسی قەدەریان کردوەو فەرمانیان پێکردوین بڕوا بەقەدەر بێنین، بەوێنە خودا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ : هەمو شتێکمان بەئەندازە بەدیهێناوە﴾[2].

﴿ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا: ئیشی خودا نەخشەیەکی ئەندازەکراوی بۆ داندراوە﴾.[3]

﴿ وَلَكِنْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولاً : بەڵام دەبێ هەرچی خوا بڕیاری داوە روبدات.﴾.[4]

﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا: خودا هەمو شتێکی بەدیهێناوەو

--

١ رواه مسلم. شرح نووي على مسلم: (١/١٥٧)

٢ القمر: ٤٩

٣ الاحزاب: ٣٨

٤ الانفال: ٤٢

**ئەندازەی گرتوە﴾.[1]**

﴿سَبِّحْ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى، وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى: **پاکیگاری ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بکە، ئەو پەروەردگارەی هەمو شتێکی بەدیهێناوەو ڕێکی خستوە، ئەو خودایەی ئەندازەی بۆ هەمو شتێك داناوەو ڕێڕونی کردوە ﴾[2].**

**طاوس: دەڵێ: چەند یاوەرێکی پێغەمبەرﷺم دیوە دەیانگوت: هەمو شتێك بەقەدەری خوایە.. دەڵێ گوێشم لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بو دەیگوت: هەمو شتێك بە قەدەری خوایە، تەنانەت دەستەوسانیو گورجوگۆڵیش[3].**

**هەروەها ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((هەندێ قورەیشی هاوبەشپەرست هاتنە لای پێغەمبەرﷺ لەبارەی قەدەرەوە مشتومڕیان لەگەڵدا دەکرد، خوداش ئەم ئایەتەی دابەزاند:** ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ، إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ: **بێبڕواکان لەرۆژی ڕابوند لەسەر ڕو بۆناو ئاگر ڕادەخشێندرێن، ئازاری ئاگری سەقەر بچێژن. ئێمە هەمو شتێکمان بەئەندازەداری بەدیهێناوە﴾[4]))[5].**

**ئایەت و فەرمودە گەلێك زۆرن کە باسی زانست و تواناو ویست و بەدیهێنانی خوا بکەن کە قەدەری خودا دەیانگرێتەوە، چونکە قەدەر بڕوابوز بەتواناو ویست و بەدیهێنانی خودا دەگرێتە خۆ، لەلاپەڕەکانی داهاتودا ئە، بابەتە ڕون دەکەینەوەو ئایەت و فەرمودەکانی لەبارەوە دێنینەوە.**

**هەروەکو ڕاغبی ئەصفەهانی لە ئیبنوحەجەر ڕادەگوێزێتەوەو دەڵێ**

---

١ الفرقان: ٢

٢ الاعلى: ١-٣

٣ موسلیم گێڕاویەتیەوە: (٤/٢٠٤٥) ژمارە (٢٦٥٥).

٤ القمر: ٤٨-٤٩

٥ موسلیم گێڕاویەتیەوە: (٤/٢٠٤٦)ژ(٢٦٥٦)، ترمذیش گێڕاویەتیەوە: صحیح سنن الترمذي (٣/٢٢٩).

قـــەدەر توانســـت و زانســـت هـــەبون دەربـــارەی پـــەیدابونی ئـــەندازەکراو دەگرێتەوە)[1].

خودا توانستێکی رەهای هەیەو هیچ شتێك ناتوانێ دەستەوسانی بکات، (القادر: بەتوانا) و (القدیر: زۆر بەتوانا)و (المقتدر: خاوەن سەرچاوەی توانا) ناوی خودان و توانستیش سیفەتێکیەتی.

(القادر) ئیسم فاعیلە لە (قدر، یقدر) هاتوە.

(القدیر) لەسەر کێشی (فەعیل)ـە، شێوازی موبالەغەیە (القدیر) واتە: هەرشتێکی بیەوێ بەپێی ئەو ئەندازەیە دەیکات کە حیکمەت دەیخوازێ، بێ زیاد و کەم. بۆیە تەنها بۆ خودا دەگوترێ و دروست نیە یەکێکیتری پێ وەسف بکرێ. خودا دەفەرموێ:

﴿ وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: خودا بەسەر هەمو شتێکدا بەتوانایە ﴾[2].

(المقتدر) لەسەر کێشی (مفتعل)ـە، لە (اقتدر)ـەوە گەردان کراوە، موبالەغەکەی لە (القدیر) پترە، خودا دەفەرموێ:

﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ : لە نیشتگەیەکی بەڕاست و پەسەندن لەلای فەرمانڕەوایەکی بەدەسەلات ﴾[3].

لە ئیمام ئەحمەدیان(رەحمەتی خوای لێبێ) پرسیوە (قەدەر) چیە؟ گوتی: قەدەر؛ توانستی خوایە[4].

ئیبنولقەییم دەڵێ: (ئیمام ئەحمەد گوتویەتی: قەدەر توانستی خودایە، ئیبنولعەقیلیش ئەم گوتەیەی زۆر پەسەند کردوەو دەڵێ: ئەم گوتەیە نیشانەی زیرەکیو زانیاریە ریشەداکوتاوەکەی (ئەحمەد)ـە کە لەبارەی بنەڕەتەکانی ئاین هەیەتی، هەروەکو ئەبو وەفاش وای گوتوە، چونکە ئینکاریکردنی قەدەر

١ فتح الباري: (١١/٧٧)

٢ الاحقاف : ٣٣

٣ القمر: ٥٥

٤ مجموع فتاوي شيخ الإسلام (٨/٣٠٨).

ئینکاریکردنی توانا هەبونی خودایە بەسەر بەدیهێنانی کردەوەی بەندەکان و نوسینەوەو ئەندازەکردنیان).

ئیبنولقەییم ئەم واتایەی لەچەند دێرە شیعرێکدا هۆنیوەتەوەو دەڵێ:

| | |
|---|---|
| فحقيقة القدر الذي حار الورى | في شأنه هو قدرة الرحمن |
| واستحسن ابن عقيل ذا من احمد | لما حكاه عن الرضى الربان |
| له قال الأمام شفى القلوب بلفظةٍ | ذات اختصار وهي ذات بيان |

بۆیە ئەوانەی بڕوا بەقەدەر ناهێنن توانستی خوا ناسەلمێنن، شێخلئیسلام ئیبنوتەیمیە(رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: (ئەوکەسەی گوتەی پێشینەکان نەڵێتەوە کەواتە توانستی خودا ناسەلمێنێ، نایسەلمێنێ کەخودا (قادر) بێ، هەروەك جەهەمیەکان و هەوادارانیان و موعتەزیلە جەبریو نەرێویژەکان(النافية)، دەڵێن: خودا بەتوانا نیە و موڵکی نیە. ئێ موڵکیش یان توانستە یان توانا پێدراوە، یان هەردوکیانە. بەهەر جۆرێك بێ دەبێ خودا توانستی هەبێو ئەوەی توانستی خوداش نەسەلمێنێ موڵکدارێتی خواش ناسەلمێنێ)[1].

ئەوانەی بڕوایان بەقەدەری خوا نەهێناوە خوایان بە یەك نەناسیوە، چونکە نەرێویژانی قەدەر دەڵێن: ((بەدیهێنەری خێرو بەدیهێنەری شەڕ جیاوازن، دەڵێن: ئەو گوناحانەی رو دەدەن بە ویستی خودا رو نادەن رەنگە بڵێن ناشیزانێ، هەروەها دەڵێن: تەواوی کردەوەی گیانلەبەران بەبێ تواناو دروستکردنی خوا رو دەدەن)). جا سەرسەختی لەویستی کاراو توانستی هەموگری(شامل) خودا دەکەن. لەبەر ئەوەیە ئیبنوعەبباس دەڵێ: قەدەر شیرازە(نظام)ی یەکخواناسینە، ئەو کەسەی خوا بەیەك بناسێو بڕوا بەقەدەر بێنێ یەکخواناسینەکەی تەواوە، بەڵام ئەوکەسەی خوا بەیەك بناسێو بڕوا

---

١ شفاء العليل : ٤٩.

بەقەدەر نەهێنێ ئەوا یەكخواناسیەكەی هەڵدەوەشێتەوە[1].

سەرجەم زانایان یەكدەنگی خۆیان ڕاگەیاندوە لەمەڕ ئەوەی كەبڕوابون بەقەدەر واجبە، هەمو زاناكانی یارانی ڕێبازو كۆمەڵ - كە مەشخەڵی نێو شەوەزەنگ و نیشانی ڕێنوێنین - بڕواهێنانیان بەقەدەر واجب كردوە، ئەوانەشیان بەبیدعەچی و نادان داناوە كە سەرسەختیان لەقەدەر كردوەو قەدەریان ڕەت كردۆتەوە.

نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێبێ) لەراڤەی فەرمودەكانی قەدەری نێو صەحیحی موسلیمدا دەڵێ: (لەم فەرمودانەوە بەڵگەی رون و ئاشكرا بۆ پاڵپشتی راڕەوی یارانی ڕێبازو كۆمەڵ و كۆڕای هاوەڵان و ئەهلی حەل و عەقدی پێشین و پاشین هەیە كە قەدەریان سەلماندوەو پێیان وایە هەمو روداوێكی خێرو شەڕو سودبەخش و زیانبەخش بەهۆی قەزاوقەدەری خواوە رو دەدەن)[2] لەجێگەیەكی‌تردا دەڵێ: (زۆر بەڵگەی قسەبڕ لەقورئان و سوننەت و كۆدەنگی یاوەران و ئەهلی حەلل و عەقدی پێشین و پاشینان لەسەر ئەوە هەن كە قەدەری خوایان سەلماندوە)[3].

ئیبنوحەجەر(ڕەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: (بۆچونی سەرجەم پێشینان ئەوەیە كە هەمو ئیش و كارێك بەقەدەری خواوە بەڕێوە دەچێ، هەروەكو خوا دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلاَّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ: گەنجینەی هەمو شتێكیش لای ئێمەیەو ئەوەشمان هەر بە ئەندازەی دیاریكراو ناردۆتە خوار﴾[4]).

---

١ مجموع فتاوى شيخ الاسلام (٨/٢٥٨).

٢ شرح النووي على مسلم : (١٦/١٩٦).

٣ شرح النووي على مسلم : (٢/١٥٥).

٤ الحجر : ٢١.

# بەندی دووەم

## چاوخشاندنێك بە مێژوی قەدەردا

بڕوابون بەقەدەر یەکێکە لە بنەڕەتەکانی بڕوا، قورئان و سوننەت چەمك و واتای قەدەریان رون کردۆتەوە، پێغەمبەرﷺ رونی کردۆتەوە کە ئەنجامدانی کردەوەو بەکارهێنانی هۆکاران (الأخذ بالأسباب) لەگەڵ قەدەردا پێچەوانەو هاودژ نیە بەڵکو ئەویش لەقەدەر دایە و نەتەوەکەشی لەو کەسانە وریا کردۆتەوە کە بڕوا بەقەدەر ناهێنن یان دژایەتی پێ لەگەڵ شەرعدا دەکەن.

جارێك پێغەمبەرﷺ بەلای هەندێ لەیاوەرانی تێپەڕی دیتی لەبارەی قەدەرەوە مشتومڕ دەکەن، تا بڵێی تورە بو، رەنگی سور هەڵگەڕا وەك بڵێی دەنکە هەنار پڵقابێتە چاوی، فەرموی: ((أبهذا أمرتم، أم بهذا أرسلت اليكم؟ انما هلك من كان قبلكم حين تنازعوا في هذا الأمر، عزمت عليكم الا تنازعوا فيه: ئەوەم فەرمان پێکردون مشتومڕ لەقەدەردا بکەن؟ یان بۆ ئەوە نێردراوم؟ گەلانی پێشو بەو جۆرە مشتومڕانەوە لەناوچون، فەرمانتان پێدەکەم مشتومڕی تێدا نەکەن))[1].

یاوەران (رەزای خوایان لێبێ) گوێڕایەڵی فەرمانەکەی پێغەمبەرﷺ بون، چ لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ و چ لەدوای مەرگیدا نەزانراوە هیچ کەسێکیان مشتومڕیان لەبارەی قەدەرەوە کردبێ.

لەسەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانیشدا یەك تاقە روداویشمان پێ نەگەیشتوە کە موسڵمانێك لەبارەی قەدەرەوە مشتومڕو دەمەوەری کردبێ. تەنها ئەوە نەبێ کە کاتی خۆی تاعون لەشام بڵاوبۆوە، عومەری کوڕی خەتاب کە دەیویست بچێتە ئەوێ، لەڕێگادا گەڕایەوە و

---

١ صحيح سنن الترمذي : (٢/٢٢٣).

خەڵكەكەی گێڕایەوە، ئەبو عوبەیدە: عامری كوڕی جەڕاحیش ڕەخنەی لێگرت و گوتی: (یاأمیر المؤمنین أفراراً من قـدر الله: فەرماندەی بڕواداران؛ لەقەدەری خوا هەڵدێی؟))

عومەریش وەڵامی دایەوەو گوتی: (ئەبو عوبەیدە! ئای ئەگەر ئەتۆ نەدەبوی خۆم دەمزانی چم بەسەر دێنا!، بەڵێ لەقەدەری خواوە بۆ قەدەری خوا هەڵدێین. باشە ئەگەر گەلە وشترێكت بردە دۆڵێك و بەرێكیان گژوگیای زۆری لێ بێ و بەرەكەی تر هیچی لێنەبێ، لەهەركام بەر بیانلەوەڕێنی بە قەدەری خوا نایانلەوەڕێنی؟!)[1].

ئەللالەكائی دەگێڕێتەوەو دەڵێ جارێكیان عومەری كوڕی خەتاب لە جابیەدا (كە هەرێمێكە لە شام) خوتبەیەكی دا و تێیدا گوتی: (من یضلل الله فلا هادي لـه: ئەوكەسەی خوا گومڕای بكات ڕێنوێنكەری نیە)، ڕیش سپیانی گاورەكانیش لەوێدا بون یەكێكیان گوتی: خوا كەس گومڕا ناكات، بەڵام عومەر دوسێ جاران هەمان گوتەی دوبارە كردەوەو ئەویش جلكی خۆی هەڵدەتەكاندو ناڕەزایی بەرانبەر گوتەكەی عومەر دەردەبڕی.

كە قسەی گاوریان بۆ تەرجەمە كرد، گوتی: (درۆ دەكەی هەی دوژمنی خوا، خوا بەدیهێناوی، خوا گومڕات دەكات، پاشان دەتمرێنێ‌و ئەگەر ویستی بێ دەشتخاتە ناو دۆزەخ، خودا سەرجەم بەدیهێناوە، كە بەدیهێنان نەوەكانی ئادەمی لەناو دەستیدا پەرت كردو بەهەشتی‌و كردەوەكانیانی نوسی، دۆزەخی‌و كردەوەكانیانی نوسی، ئەنجا فەرموی: (ئەوانە بۆ بەهەشت و ئەوانەش بۆ دۆزەخ) بەم جۆرە خەڵك لەیەكتر دابڕان، كەسیش دەربارەی قەدەر جیاواز نابن)[2].

یەكەم كەس كە مشتومڕی لەقەدەردا كرد پیاوێكی خەڵكە بەسرا بو، كاری

---

١ صحيح البخاري، سەرنج بدە فتح الباري (١٠/١٧٩) ژ (٥٧٢٩)

٢ شرح اصول اعتقاد اهل السنة للالكائي: (٣/٦٥٩).

ـەقالٌی دەکـردو نـاوی (سەلسـەویٚ) بـو. ئـەوزاعی دەڵـێ: ((یەکـەمین کـەس
دەمەوەری لەقەدەردا کردبێ پیاوێك بو لەعێراق، ناوی (سەوسەن) بو و، پێشتر
گ‌ ی‌ر بو و ببوە موسڵمان، بەڵام پاشان ببۆوە گاور، مەعبەدی جوهەنی لەو فێر
بـ غەیلانیش لەمەعبەد فێر بو))[1].

یونسی کوڕی عوبێد دەڵێ: (چومە بەسرا هیچ کەسێکی قەدەری لیٚنـەبو،
تەنها سەنسەویٚو مەعبەدی جوهەنیو مەلعونێکی بەنی عوافە نەبێ)[2].

موسلیم لـە صەحیحەکـەیدا لـە بورەیـدەی کـوڕی یـەحیای کـوڕی یـەعمور
دگێرێتـەوە کـە گوتویـەتی: یەکـەمین کـەس دەمـەوەری لەقـەدەردا کردبـێ
مەعبەدی جوهەنی بو لە بەسرا) بورەیدە لەقسەکەیدا ئەوەش دەڵێ کە مەعبەدو
هاوبیرانی پێیان وابو ((قەدەر نیەو کار بڕاوەتەوە))[3].

ئەو یاوەرانەی هێشتان مابون، وەکو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئیبنوعەباس
و وائیلەی کوڕی ئەصقەع و جابری کوڕی عەبدوڵڵاو ئەبو هورەیرەو ئەنەسی
کوڕی مالیك، ئەوانە زۆر بەتوندی وەڵامیان دانەوە و دژیان وەستان)[4].

پاشان ماموٚتکانی موعتەزیلەکانی وەکو واصیلی کوڕی عەتاو عەمری کوڕی
عوبێدو غەیلانی دیمەشقیٚ ئەو بۆچونەیان لەمەعبەد وەرگرت و فێربون.

واصیلی کوڕی عەتائی ماموٚتك(رأس)ی موعتەزیلـەکان، پێـی وابـو داکۆکـی
دەکات و دەیگوت: دروست نیە شەڕ بدرێتە لای خوا، چونکە خوا حەکیمـە،
ناکرێ داوای شتێکی وا لەبەندەکانی بکات پێچەوانەی فەرمانەکەی بێت، یان
لەسەریان بکاتە حەتمیو پاشانیش سزاو پاداشتیان لەسەر بداتەوە.

لەقسـەکانیدا دەڵـێ: بـەندە خـۆی بکـەری خـێرو شـەڕو بـڕواو بێـبڕواییو
گوێڕایـەڵی و سـەرپێچیە، بـە گوێـرەی کردەوەکـانی خـۆی سـزاو پاداشـت

---

[1] شرح اصول الاعتقاد: (٣/٧٥٠) هەروەها سەرنج بدە الشريعة للآجري: ٢٤٢.
[2] شرح اصول اعتقاد اهل السنة: (٣/٧٤٩).
[3] شرح النووي على مسلم: (١/١٥٠).
[4] بگەڕێوە بۆ (الفرق بين الفرق): ل١٩.

وەردەگرێ، بەڵام خودا وای کردوە توانای ئەم شتانەی هەبێ[1].

نیزامی موعتەزیلە بۆ ئەوە چوەو دەڵێ: خودا بەوە وەسف ناکرێ توانای لەسەر شەڕو سەرپێچییەکان هەبێ، ئەوەش توانراو نیە بۆ خودا[2].

زاناکانمان ناویان لەم چینە ناوە (قەدەریەکان) بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە، چونکە ئەوان پێیان وایە بەندە هەندێ کردەوەی هەیە هەر بەخۆی بەتەنیا ئەنجامی دەدات بێ ئەوەی توانای خوای تێدا بێ و نەرێشیان لەوە کردوە کە شتەکان بە قەزاوقەدەری خوا بن.. ئەو چینە لەگەڵ ئەوەی خۆیان گومڕان کەچی ئەم ناوە بە نێوچەوانی رێنوێنبوەکان دەلکێنن و پێیان دەڵێن: بەڵکو ئێوە قەدەرین چونکە پێتان وایە هەمو شتێك بەقەدەری خوا بەڕێوە دەچێ، بۆیە ئێوە شایستەترن ئەو ناوەتان هەبێ[3].

نەوەویش لە راڤەی صەحیحی موسلیمدا دەڵێ: (هەندێ لە قەدەریەکان دەڵێن: ئێمە قەدەری نین، بەڵکو ئێوە قەدەرین چونکە ئێوە بڕواتان بەقەدەر هەیە).

ئیبنو قوتەیبە و پێشەوا (مەبەستی جوەینی پێشەوایە) دەڵێ: ئەم قسەیە چەواشەکردن و درۆ و بێشەرمیە چونکە ئەهلی هەق هەمو کاروبار و قەدەرو کردەوەکانیشیان بۆ خوا دەگەڕێننەوە، ئەو نەزانانەش بۆ خۆیان دەگەڕێننەوە. جا یەکێك شت بۆ خۆی بگەڕێنێتەوەو بیداتە پاڵ خۆی ئەو پێی شایانترە پێی بگوترێ قەدەری نەك یەکێك پێی وابێ یەکێتیتر دەیکات و بۆ جگە لەخۆی بگەڕێنێتەوە)[4].

صەحیحیشە کە پێغەمبەرﷺ ناوی لەقەدەریەکان ناوە ئاگرپەرستی ئەم نەتەوەیە. فەرمودەکەش ئەبوداود لەسونەنەکەیو ئەلحاکم لەموستەدرەکەکەیدا

---

١ الملل والنحل للشهرستاني: (٤٧/١).
٢ الملل والنحل: (٥٤/١).
٣ جامع الاصول لأبن اثير: (١٢٨/١٠).
٤ شرح النووي على مسلم: (١٥٤/١).

تەخریجیان کردوە، دەڵێ: (صحيح على شرط الشيخين، إن صحَّ سماع أبي حازم من ابن عمر)[1].

بۆیە پێیان گوتراوە ئاگرپەرستی ئەم نەتەوەیە چونکە (بۆچونی ئاگرپەرستەکان کاوێژ دەکەنەوە کە دەیانگوت: دو بنەڕەت(أصل) هەن؛ روناکیو تاریکی، پێیان وایە خێر لەکردەوەی روناکیەو شەڕیش کردەوەی تاریکیە، بۆیە ببونە دوپەرست، قەدەریەکانیش بەهەمان شێوە خێر بۆ خوا دەگەڕێننەوەو شەڕیش بۆ غەیری خودا. بەڵام خوای بەرز و مەزن بەدیهێنەری خێرو شەڕە. هیچێکیان بەبێ ویستی خودا رونادەن، هەردوکیان لەروی بەدیهێنان و پەیداکردندا بۆ خوا دەگەڕێندرێنەوە، بەڵام لەروی کردن و ئەنجامدانیدا بۆ بەندەکانی دەگەڕێندرێتەوە).[2][3]

لە ئاخیرو ئۆخری سەردەمی بنەماڵەی ئەمەویەکاندا چینێکیتر پەیدا بون پێیان وابو مرۆڤ لەئەنجامدانی کردەوەکانیدا ناچارو تۆبزی لێکراوەو هیچ سەربەستیەکی لە وەرگرتن و وازهێنانەکانیدا نیە، هەندێکی تریان توانایەکی بێکاریگەریان بۆ بەندە دەسەلماند. یەکەمین کەس کە ئەو قسەیەی هێنایە ئاراوە (جەهمی کوڕی صەفوان) بو، کە دواتر ئەم بیدعەیە بوە سەرچاوەی چەندین قسەی ناقۆڵاو ناشیرین و چەندان گومڕایی گەورە گەورە.[4]

ئەم قسەیە بەنێو نەتەوەی ئیسلامیدا بڵاوبۆوەو خواپەرست و دنیا بەکەمگر(زاهد)و بەناوسۆفی زۆر کاوێژیان دەکردەوە. جا ئەگەر چینی یەکەم هاوچونی ئاگرپەرستان بن، بەڵام چینی دوەم هاوچونی هاوبەشپەرستانن کەدەیانگوت: ﴿لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ:

---

١ شرح النووي على مسلم: (١٥٤/١).

٢ ئەوەوی ئەم گوتەیەی لە ئەخەتابی راگواستۆتەوە نێو راڤەی صەحیحی موسلیم: (١٥٤/١). هەروەها سەرنج بدە جامع الاصول: (١٢٨/١٠).

٣ لەو شوێنەی باسی گومڕایان دەکەین گومڕاییو بیروباوەڕی ئەم چینە زێتر رون دەکەینەوە.

٤ بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوى شيخ الاسلام: (٤٦٠/٨)، الملل والنحل للشهرستاني: (٨٥/١)

**ئەگەر خوا مەیلی لێبا، ئێمە و باب و باپیرانمان، بتپەرستیمان نەدەکرد، هیچ شتیشمان لەخۆمان حەرام نەدەکرد﴾[1].**

**چینی دوەم لەچینی یەکەم خراپترو بەدفەرترن چونکە چینی یەکەم کردەوەکانی بەندەیان لە بەدیهێنانی خوا هاوێر دەکرد و جیا دەکردەوە، بەلام ئەمر و نەهیان بەگەورە دەگرت، بەلام چینەکەیتر قەدەریان سەلماندوەو بەهۆی قەدەر ئەمر و نەهیان پوکاندۆتەوە.[2][3]**

١ الانعام : ١٤٨.

٢ عقيدة السفاريني : ١/٣٠٦.

٣ لەدوایدا پتر لەبارەی ئەم چینە دەدوێین.

# بەندی سێیەم

# پێناسەی قەزاوقەدەر

## جێباسی یەکەم

## پێناسەی قەدەر

(قەدەر چاوگە، دەڵێی: قَدَرت الشّيء، أقْدِرُهُ قَدْراً و قَدَراً، ئەگەر بەئەندازەی ئەوت دانا)[1].

قەدەر لەزماندا واتە (حوکم و بڕیاردان و ئەندازەی شت. تەقدیریش واتە رامان و بیرکردنەوە بۆ ڕێکخستنی کارێك)[2].

لەزاراوەشدا قەدەر : (ئەوەیە کە خودا لەپێشتردا زانیوێتی چ رو دەدات و قەڵەمیش نەخشی لەهەمو ئەو شتانە داوە کە تاهەتایە رو دەدەن، خودای ﷻ ئەندازەی سەرجەم بەدیهێنراوان و هەمو شتێکی هەر لە ئەزەلەوە خەمڵاندوە بەرلەوەی بێنە ئارا، خودا زانیویێتی لەچ کاتێکی دیاریکراو و بەچ چۆنیەتیەك رودەدەن، ئەوجا بەگوێرەی خەمڵاندنەکە رودەدەن و دێنە ئارا)[3].

ئیبنوحەجەر لەپێناسەی قەدەردا دەڵێ: (مەبەست لەقەدەر ئەوەیە کە خودا ئەندازەو کاتی شتەکانی زانیوەبەر لەوەی بێنە دی، پاشان هەر شتێکی لەزانستدا دانابێ ببێ دەیهێنێتەدی، هەمو پەیدابویێکیش بەگوێرەی زانست و

---

١ فتح الباري : (١/١١٨).

٢ القاموس المحيط : ل٥٩١.

٣ عقيدة السفاريني : (١/٣٤٨).

توانست و ویستی خودا دێتە دی)[1].

سەفارینی لە ئەشعەریەکانەوە رادەگوازێتەوەو دەڵێ: (قەدەر ئەوەیە کە خوا بەگوێرەی ئەندازەیەکی تایبەتیەوە شت پەیدا بکات و ئەندازەی دیاریکراوی خود و حاڵی شتەکانیش کتومت بەپێی زانستی پێشوی خواو نەخشی قەڵەم بێ)[2].

ئەم پێناسانە لەگەڵ یەکتردا نزیکن و دەرەنجامەکەشیان ئەوە دەگەیەنێ کە قەدەری خوا دو شتان دەگرێتەوە:-

**یەکەم** : زانینی ئەزەلی خودا کە لەدێرینەوە حوکمی لەسەر پەیدابوەکان داوە کە خودا دەیەوێ بێنەدی، هەروەها ئاکارو سیفەتی بەدیهێنراوەکانیشی دیار کردوە کە دەیەوێ بیهێنێتە بون. هەر هەموشی بە وتەکانی خۆی لە تەختی پارێزراودا نوسیوە. زۆر بەوردی باسی ئەرزو ئاسمان و قەبارەو دوریو چۆنیەتی پەیدابونیان و هەرچی و لەناویاندایە و تێیاندایە لەتەختی پارێزراودا نوسراون.

**دوەم** : پەیداکردنی ئەو شتانەی کە خودا بەگوێرەی زانستی پێشترو نەخشی قەڵەم تەقدیری کردوە پەیدایان بکات، جا هەرچی دێتە جیهان و پەیدا دەبێ کتومت وەکو زانستی پێشتری نوسراو وایە.

(قەدەر) زۆرجاران ئەوەی پێ مەبەستە کە بریتیە لەخەملاندنی پێشتر لەزانستی خوادا. زۆر جارانیش بەدیهێنان و پەیداکردنی پێ مەبەستە کە بەگوێرەی زانستی خوا دەبێ.

لە (ئیمام شافیعی)یان پرسی(رەحمەتی خوای لێبێ) قەدەر چیە؟ ئەویش بەشیعر[3] وەڵامی دانەوەو گوتی:

---

١ فتح الباري : (١/١١٨).

٢ عقيدة السفاريني : (١/٣٤٥).

٣ الاعتقاد البيهقي: ل١٦٢. شرح اصول إعتقاد أهل السنة للالكائي: ١/٧٠٢.

فما شئت كان وان لم أشأ ... وما شئت ان لم تشأ لم يكن

خلقت العباد على ما علمت ... ففي العلم يجري الفتى والمسن

على ذا مننت وهذا خذلت ... وهذا أعنت وهذا لم تعن

فمنهم شقي ومنهم سعيد ... ومنهم قبيح ومنهم حسن

واته: ئەوەی تۆ ویستت بو ئەگەرچی منیش نەمویست، ئەوەی منیش ویستم و تۆ نەتویست نەهاتە دی.

بەندەکانت بەپێی زانیاریەکانی پێشوت بەدیهێناوە، رەوشی جحێڵ و پیران بەگوێرەی زانینەکەت دەبی.

بەهرەت بەسەر ئەمدا هەڵرژتوە و ئەوەت ریسواکردوە، یارمەتی ئەمت داوەو یاریدەی ئەوت نەداوە. پیاوی وا هەیە بەدبەختەو هی واش هەیە خۆشبەخت، هی وا هەیە دزێو و ناشرین و هی واش هەیە جوانە.

## جیّباسی دووەم

## پیّناسەی قەزا

((قەزا: واتە: یەکلاکردنەوەو حوکمدان. لەفەرمودەکانی پیّغەمبەرداﷺ زۆر جار باسی (قەزا) کراوە. لەبنەڕەتدا واتە بڕاندنەوەو یەکلاکردنەوە. دەڵیّن: قضى يقضي قضاءاً فهو قاض، ئەگەر حوکمیّك بدات و شتیّك یەکلابکاتەوە. (قضاء الشيء) واتە بڕیار لیّدان و تیّپەڕاندن و لیّبونەوە. بەواتای بەدیهیّنانیش دیّت.

زوهری دەڵیّ: (القضاء) لەزماندا واتای جۆراوجۆر دەبەخشیّ، لە بنەڕەتدا واتە بڕانەوەو تەواوبونی شتیّك. هەر شتیّکیش بڕیاری ئەنجامدانی بدریّ یان تەواو بکریّ یان بەجیّ بگەیەنریّ یان واجب بکریّ یان بزاندریّ یان جیّبەجیّ بکریّ یان راپەڕیّندریّ واتە قەزا کراوە، هەمو ئەو واتایانەش لەفەرمودەکاندا هاتون[1].

زانایان لەجیاوازی نیّوان وشەی قەزاو وشەی قەدەردا دو قسەیان هەیە:

یەکەم، دەڵیّن: قەزا ئەو زانیاریە ئەزەلیەی خودایە کە حوکمی پیّداوە، قەدەریش پەیدابونی بەدیهیّنراوانە بە پیّودانی ئەو فەرمانە پیّشینەیەی کە قەزا کراوە. ئیبنوحەجەری عەسقەلانی(رەحمەتی خوای لیّبیّ) دەڵیّ: زانایان گوتویانە قەزا بریتیە لەحوکمی هەموەکیو تیّکڕایی لە ئەزەلدا، قەدەریش وردەو چەندو چۆنی حوکمەکەیە)[2].

لەجیّگایەکی تردا دەڵیّ: (قەزا حوکمدانیّکی هەموەکیە لە ئەزەلدا لەپیّناو تیّکڕا(الاجمال)دا، بەڵام قەدەر حوکمدانی هاتنەدی وردەواڵەی هەموەکیەکانە

---

١ النهاية في غريب الحديث لابن الأثير: (٧٨/٤)

٢ فتح الباري: (٤٧٧/١١).

ـﻪپێناو چەندوچۆن(تفصیل)دا)[1].

دوەم، دەڵێت: بەپێچەوانەوە؛ قەدەر حوکمی پێشینەیەو قەزاش بەدیهێنانە.

ئیبن بەتتاڵ دەڵێ: ((قەزا؛ بەدیهێنراوە[2] خەتابیش لە (معالم السنة)دا ـدڵێ: (قەدەر ناوی قەدەرکراوەکانی کردەی قادیرە. هەروەکو هەدم و نەشرو قەبض کە ناوی کردەی هادم و ناشرو قابیضە) )).

بەپێی ئەم واتایە (قەزا) بەدیهێنان دەگەیەنێت، خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ: ئەوساکە ئاسمانی لەدو رۆژدا وەدیهێنا﴾.[3][4]

بەپێی ئەم گوتەیە: (قەزای خوا لە قەدەر تایبەتترە، چونکە یەکلاکردنەوەی ـو ئەندازەکراو دەگەینێ، قەدەریش ئەندازەکراوەکەیە، قەزاش یەکلاکردنەوەو براندنەوەیە)[5].

زۆر ئایەت هەن راستێتی ئەم گوتەیە دەسەلمێنن، بۆ نمونە خودا دەفەرموێ:

﴿وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا: ئەم فەرمانەش هەر دێتەدی﴾[6].

﴿كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَقْضِيًّا: بڕیارێکە پەروەردگارت داویەتی و هەردەبێ جێبەجێ ببێ﴾[7].

﴿فَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ: هەر کە ویستی کارێ پێك بێ،

---

١ فتح الباري: (١١/١٤٩).
٢ فتح الباري: (١١/١٤٩).
٣ فصلت: ١٢
٤ معالم السنن للخطابي: (٧/٧٠).
٥ المفردات للراغب الاصفهاني: ل٤٠٦.
٦ مريم: ٢١.
٧ مريم: ٧١.

فەرمان دەدا ببە! دەبێ ﴾[1].

بەپێی ئەم گوتەیە قەزاوقەدەر دو شتی هاوبەندی یەکترین و هیچیان لەوی‌تر جیا نابێتەوە، چونکە یەکێکیان وەکو بناغە وایە کە قەدەرە، ئەوی‌تریش وەکو خانو وایە کە قەزایە، ئەوکەسەی بیەوێ لەیەکیان جودا بکاتەوە وەکو ئەوە وایە خانوەکە بڕوخێنێ و هەڵیوەشێنێتەوە)[2].

---

١ بقرة: ١١٧.

٢ النهايه في غريب الحديث لأبن الأثير: (٤/٧٨)، تەماشای جامع الاصول: (١٠/١٠٤) بکە.

## جێباسی سێیەم

## پایەکانی بڕوابون بەقەدەر

بڕوابون بەقەدەر لەسەر چوار پایە وەستاوە، هەرکەسێك بڕوای پێ هەبێ بڕوایەکی تەواوی بەقەدەر هێناوە، بەڵام ئەگەر بڕوای بەیەکێکیان یان بەپتر نەبێ بڕواکەی شێرزە دەبێ، چوار پایەکەش ئەمانەن:

یەکەم: بڕواهێنان بەزانستی خوا کە سەرتاپاگیرەو گشت شتێکی گرتۆتەوە.

دوەم: بڕواهێنان بەوەی کە هەرچی روی داوەو تا رۆژی قیامەت رودەدات هەرهەموی لە تەختی پارێزراو(لوح المحفوظ)دا نوسراوە.

سێیەم: بڕوابون بە ویستی کاراو توانستی تەواوی خودا، واتە ئەوەی خودا بیەوێ دەبێ و ئەگەر نەشیەوێ نابێ.

چوارەم: خودا هەمو پەیدابویەکی بەدیهێناوەو هاوبەشی نیە.

هەریەك لەم چوارانە کەمێك بەدرێژی رون دەکەینەوە.

**پایەی یەکەم/ بڕوابون بەزانستی هەموگر(شامل)ی خودا:**

لەگەلێك ئایەت و سوننەتی پێغەمبەردا ئەم بنچینە گەورەیە سەلمێنراوە کە زانستی خوا پەی بەهەمو شتێك بردوە، ئەوەی بوەو دەبێ زانیویێتی و دەیزانێ، ئەوەش کە نەبوە ئەگەر ببا دەیزانی چۆن دەبو، خودا زانسی بەهەبون و نەبون و بە بەرتوان(ممکن) و مەحاڵان هەیە. خوا بەئاکام و بژێوی و ژیوار(احوال)و جوڵەو نەجوڵان و بەدبەختیو بەختەوەری بەندەکانی زانایە، دەزانێ کامیان بەهەشتیەو کامیان دۆزەخیە، بەرلەوەی بەدیان بهێنێ و بەرلەوەی زەمین و ئاسمان بێنێتە ئاراوە هەمو ئەمانەی زانیوە.

ئەمانە گشتیان لە داخوازی سیفەتمەندبونی خودایە بە (زانست)،

لەداخوازی ئەوە دایە کە خودا زاناو هەواڵدەر و بیسەرو بینایە.

خودا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ: خودا ئەو خودایەیە کە هیچ پەرستراوێکی تری لەگەڵدا نیە، لە نەدیار و لە دیاران ئاگادارە ﴾[1].

﴿ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا: تا بزانن خودا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو زانستی خودا هەمو شتی دورەداوە ﴾[2].

﴿ عَالِمِ الْغَيْبِ لاَ يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ وَلاَ أَصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ وَلاَ أَكْبَرُ: خودا زانایە بە پەنامەکی، گەردێك چیە لەئاسمان و لەزەویدا بەڵکو لەگەردیش بچوکتر و گەورەتری لێ بزر نابێ ﴾[3].

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ: پەروەردگارت لەو کەسانەی لەرێگەی ئەو لایانداوە لەگشت کەس- ئاگادارترەو هەر خۆیشی باشتر دەزانێ کێ لەسەر راستەڕێیە﴾.[4]

﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ: خودا بەئێوە زاناترە کە ئێوەی لەخاك دروستکرد، هەروەها کە ئێوە لەناو زگی دایکتاندا کۆرپەلە بون ﴾.[5]

خودا لەم بارەوە کە ئەو شتەی نەشبوە ئەگەر ببوایە دەیزانی، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ: خۆ ئەگەر بگەڕێنرێنەوە بۆ دنیا هەر دەست

---

١ الحشر ٢٢.

٢ الطلاق: ١٢.

٣ سبأ: ٣

٤ النحل: ١٢٥

٥ النجم: ٣٢.

ـدکەنەوە بەو کاروکردەوانەی کە جاران دەیانکرد ﴾.[1]

جا خوای گەورەش دەزانێ کە ئەم درۆزنانەی لە رۆژی قیامەت ئاواتەخوازن بگەڕێنرێنەوە دنیا، گەر بگەڕێنرێنەوە هەر دەگەڕێنەوە سەر کاری بەدرۆخستنەوەو گومڕاییان.

دەربارەی ئەو بێبڕوایانەی کە لەباریاندا نیە گوێ بگرنە رێنوێنی دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لأَسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَهُمْ مُعْرِضُونَ: خۆ ئەگەر خوا خێری تیا بەدی بکردنایە، وای لێدەکردن کە حەق و راستی ببیستن، خۆ ئەگەر حەقیش ببیستن، هەر خۆ دوور دەگرن و پشت (لە بەرنامەی خوا) دەکەن ﴾.[2]

هەروەها خودا بەحاڵەتی ئەو مندالآنەی مردونە شارەزایەو دەیزانی ئەگەر گەورە بوبان کردەوەیان چۆن دەبو.

ئیبنوعەباس دەڵێ: لەپێغەمبەریان پرسی ﷺ منداڵە موشریکەکان لێپرسینەوەیان چیە؟ فەرموی: ((الله اعلم بما کانوا عاملین: خودا زاناترە چیان دەکرد)) [3].

خاتو عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: منداڵێك مرد و منیش گوتم ئای خۆشی لەخۆی دەبێتە چۆلەکەیەکی بەهەشتێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((او لا تدرین ان الله خلق الجنة والنار، فخلق لهذه أهلاً ولهذه أهلاً: ئەدی نازانی خودا بۆ بەهەشت و دۆزەخ خەلکانی بەدیهێناوە؟)) [4].

لەگێڕانەوەیەکی تردا خاتو عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: بانگی پێغەمبەر ﷺیان کرد بچێتە سەر تەرمی منداڵێکی ئەنساریەکان، منیش گوتم:

---

١ الانعام: ٢٨

٢ الانفال: ٢٣

٣ رواه البخاري، سەرنج بدە فتح الباري: (١١/٤٩٣)، ورواه مسلم بلفظه عن ابي هريرة: (٤/٢٠٤٩)ژ(٢٦٥٩).

٤ رواه مسلم.

ئەی پێغەمبەری خوا! خۆشی لەخۆی دەبێتە چۆلەکەیەکی بەهەشتێ، خۆ خراپەی نەکردوە. فەرموی:

((او غير ذلك يا عائشة، ان الله خلق للجنة أهلاً، خلقهم لها وهم في أصلاب آبائهم، وخلق للنار أهلاً، خَلَقهم لها وهم في أصلاب آبائهم: یان جگە لەمە ئەی عائیشە! خودا هەندێ خەڵکی هەر لەپشتی باوانەوە بۆ بەهەشت بەدیهێناوەو بۆ ئاگریش هەروەتر))[1].

ئەم فەرمودانە لەم بارەوە دەدوێن کە خودا عیلمی بەوانە هەیە کە لەمنداڵیدا مردون، نەك مەبەست ئەوەبێ خودا بەگوێرەی زانینی خۆی دەیانخاتە دۆزەخ و بەهەشت و بێئەوەی کردەوەشیان ئەنجامدا بێ.

شێخلئیسلام ئیبنوتەیمیە (رەحمەتی خوای لێبێ) لەبارەی فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺ کە لەبارەی منداڵە مردوەکانی هاوبەشپەرستانی فەرموە، دەڵێ: ((الله اعلم بما كانوا عاملين: دەیزانی ئەگەر گەورە بوبان کامیان بڕوایان دێناو کامیان بێبڕوا دەبون))، لەفەرمودەیەکی تریشدا کە ئیسنادەکەی لەگەڵ فەرمودەکەی ئەبوهورەیرەدا(رەزای خوای لێبێ) نزیکە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((اذا كان يوم القيامة فان الله يمتحنهم ويبعث اليهم رسولا في عرصة القيامة، فمن اجابه ادخله الجنة، ومن عصاه ادخله النار: لەرۆژی قیامەتدا لەگۆڕەپاندا خودا تاقییان دەکاتەوەو پێغەمبەریان بۆ دەنێرێ، جا ئەوەی وەڵامی پێغەمبەرەکەی داوە دەچێتە بەهەشت و ئەوەی وەڵامیشی نەدایەوە دەچێتە دۆزەخ))، لەوێشدا زانستی خودایان تێدا دەردەکەوێو بەگوێرەی بڕواو بێبڕوابونیان، سزاو پاداشتیان دەداتەوە نەك تەنها بەگوێرەی زانست بێ)[2].

---

١ صحيح مسلم: ٤/٢٠٥٠ ژمارە (٢٦٦٢).

٢ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: ٢٤٦/٤.

ـەنگە عەقلیەکان دەربارەی ئەوەی کە خودا بەرلەوەی بەدیهێنراوان بێنێتە ... وە ئەندازەیانی زانیوە.

...بونی ئەم گەردونەو بونی هەمو بەدیهێنراوەکان بەئاشکرایی بەڵگە ...دەستەوە دەدەن کە بەر لەوەی خودا بەدیان بێنێ عیلمی پێیان هەبوە (چونکە ...حاڵە خودا بەنەزانینەوە بونەوەری هێنابێتە بون لەبەرئەوەی هێنانەبونەکە ...ستی گەرەك بوە، ویستیش وێناکردنی مەبەست دەخوازێ، وێناکردنی ...ستیش مانای زانستی مەبەستە، کەواتە پەیداکردن(الایجاد) ویست ...خوازێ، ویست زانست دەخوازێ، کەواتە پەیداکردن زانست دەخوازێ)[1].

...ەروەها (بونەوەران وردەکاریو رێکوپێکیەکی وایان تێدایە کە وادەخوازێ ...یهێنەرەکەیان زانستی هەبێ، چونکە رێی تێناچێ نەزانێك کردەوەی ...وینەو مەحکەم و پوختە ئەنجام بدا)[2].

...زانایان بەهۆی زانستی ئافەریدانەوە دەسەلمێنن کەخودا زانستی هەیەو ...حێن (لەناو بەدیهێنراواندا هی وا هەیە زانایە، زانستیش سیفەتی ...ەواوەمەندێتیە، کەواتە ناکرێ بەدیهێنەریش زانا نەبێ)[3] ئەم بەڵگەخوازیە دو ...شێوەی هەیە:

...یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێن: بەڵگەنەویستە کە دەزانین بەدیهێنەر ...بەدیهێنراوەکان تەواوەمەندترە، هەروەها واجب لە مومکین تەواوەمەندترە، ...ڵگەنەویستیشە کە دەزانین ئەگەر ئەم دو گریمانەمان دانا:

یەکێکیان ئەوەیە کە زانابێ، ئەوەی تریش ئەوەیە کە زانا نەبێ، دیارە زانا ...ەواوەمەندترە، جا ئەگەر بەدیهێنەر زانا نەبێ ئەوا دەبێ مومکینەکە لەو زاناتر ...بێ. کە ئەوەش قەت نابێ.

---

1- شرح الطحاوية: ل١٤٨

2- شرح الطحاوية: ل١٤٨

3- هەمان سەرچاوە.

دوەمیان: هەمو زانستێکی بەدیهێنراوان لەخوداوەیە، جا مومکین نیە بکەری تەواومەندو داهێنەری بونەوەر زانستی نەبێ، بەڵکو ئەو شایانترە، چونکە ئەگەر تەواومەندێتی بۆ بەدیهێنراو بسەلمێ ئەوا بۆ بەدیهێنەر شایانترە، ئەگەر بەدیهێنراوش لەکەموکوڕی بێبەش بێ ئەوا دەبێ بەدیهێنەر بێبەشتر بێ)[1].

دەتوانی ئەم هەمو بەڵگەیە لەم ئایەتەوە بەدی بکەیت: ﴿ أَلاَ يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ: ئایا نازانێ کێی بەدیهێناوە؟ لەکاتێکدا خۆی وردکار و بەئاگا و شارەزایە؟ ﴾.[2]

هەروەها ئەوەش بەڵگەیە بۆ زانستی خوا کە خودا هەواڵی پەیدابون و روداوەکانی راگەیاندوە بەر لەوەی روبدەن، خودای گەورە لەپەیامە ئاسمانیەکانی پێشودا باسی هاتنی پێغەمبەرﷺ و ئاکارو رەوشت و نیشانەکانی کردوە، هەروەها باسی چەندان سیفەتی نەتەوەکەی کردوە، لەقورئاندا هەواڵی داوە لەماوەی چەند ساڵی داهاتودا رۆمەکان بەسەر فارسە ئاگرپەرستەکان زاڵ دەبن، هەرواش روی‌دا، هەروەها زۆر هەواڵی رودانی شتە پەنامەکی‌و ئایندەییەکان لەقورئان و سوننەتدا هاتوە.

**پایەی دوەم/ بڕواهێنان بەوەی کەخودا هەمو شتێکی لەتەختی پارێزراودا نوسیوە:**

دەقەکانی قورئان و سوننەت لەو بارەوە زۆرن کە ئەوەمان بۆ دەردەخەن خودا هەمو شتێکی لەتەختی پارێزراو(لوح المحفوظ)دا نوسیوە.

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو: ((كتب الله مقادير الخلائق قبل ان يخلق السموات والآرض بخمسين الف سنة، قال: وعرشه على الماء: خودا بەپەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی

---

١ شرح الطحاوية: ل١٤٨.

٢ الملك: ١٤.

ئاسمانەکان و زەوی بەدیبهێنێ قەدەرو ئەندازەی سەرجەم بەدیهێنراوانی نوسیوە، گوتی: عەرشەکەشی لەسەر ئاو بو))[1].

ترمزیش بەم جۆرەی گێڕاوەتەوە: (قدر الله المقادير قبل ان يخلق السموات والأرض بخمسين الف سنة)[2].

عوبادەی کوڕی صامت(رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((إن اول ما خلق الله القلم فقال: اكتب، قال: ما اكتب؟ قال: أكتب القدر ما كان، وماهو كائن الى الابد: یەکەمین شت کە خوا دروستی کرد پێنوس بو، پێی فەرمو: بنوسە، گوتی: چ بنوسم؟ فەرموی: ئەو قەدەرە بنوسە کە بوە، ئەوانەش بنوسە کە دەبن تا هەتایە))[3].

خودا ئەو تەختە پارێزراوەی کە هەمو شتێکی بەدیهێنراوانی تێدا نوسیوە، ناوی لێناوە: پەرتوك، پەرتوکی رون، پێشەوای رون، ئوممولکیتاب، پەرتوکی نوسراو.. خودا دەفەرموێ:

﴿ بَلْ هُوَ قُرْآنٌ مَجِيدٌ، فِي لَوْحٍ مَحْفُوظٍ: بەڵکو ئەوە قورئانێکی شکۆمەندەو لەتەختی پارێزراو دایە ﴾.[4]

﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ: ئەدی نەتزانیوە خودا هەمو شتێکی ئەرزو ئاسمان دەزانێ، ئەوە لە پەرتوکدا نوسراوەتەوە﴾.[5]

---

١ رواه مسلم في صحيحه: ٤/٢٠٤٤، (٢٦٥٣)

٢ سنن الترمذي (٤/٤٥٨) (٢١٥٦) وقال فيه: حديث حسن صحيح.

٣ قال ابو عيسى الترمذي: وهذا حديث غريب من هذا الوجه. سنن الترمذي: ٤/٤٥٨ (٢٠٥٥) والحديث صحيح فالغرابة انما في الوجه الذي اورده الترمذي في باب القدر، والا فانه قد اورده في كتاب التفسير وقال فيه حديث حسن غريب. وقد اورده الشيخ ناصرالدين الالباني في صحيح سنن الترمذي: (٢/٢٢٨) وذكر انه خرجه في سلسلة الاحاديث الصحيحة وغيرها.

٤ البروج: (٢١-٢٢)

٥ الحج: ٧٠.

﴿ وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِــي إِمَــامٍ مُبِيــنٍ: هەمو شتێکمان لە کتێبێکی ڕونکەرەوە هەرژماردوە ﴾.[1]

﴿ وَالطُّورِ، وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ، فِي رَقٍّ مَنْشُــورٍ: سوێند بەشاخی (طور) و بەپەڕتوکی نوسراو کە لەپێستی والآیە ﴾.[2]

﴿ وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِــيٌّ حَكِيــمٌ: قورئانمان لەتەختی پارێزراودا نوسیوەو لەلای ئێمە شوێنپایەی بەرزەو پڕە لە کارزانی ﴾[3].

**پایەی سێیەم/ بڕوابون بە ویســتی هــەموگر و توانــستی کــارای خــودا:**

ئەم بنچینەیە وا دەخوازێ کە دەبێ بڕوامان وابێ خودا ویستێکی کاراو توانستێکی هەموگری هەیە، ئەوەی خوا ویستوێتی بوەو ئەوەی نەیویستوە نەبوەو نابێ. هەمو جموجوڵ و سرەوت(سکون)ێکی ئەرزو ئاسمان بەویستی خوا بەڕێوە دەچێ، تەنها ئەوەی خوا دەیەوێ ئەوە لەموڵکی ویدا ڕودەدات.

گەلێك ئایەتی واتا ڕون لەم بارەوە هەن:

﴿ وَمَا تَشَاءُونَ إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّــــهُ: ویستی هیچ شتێك ناکەن مەگەر خوا ویستی لەسەر بێ ﴾[4].

﴿ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَا إِلَيْهِمُ الْمَلاَئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ الْمَوْتَى وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَــــيْءٍ قُبُلاً مَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا إِلاَّ أَنْ يَشَاءَ اللَّــــهُ: ئەگەر فریشتەمان بۆ دابەزاندبان و مردیەکانیش قسەیان دەگەڵ کردبان و هەمو شتمان لە ڕوبەڕوی ئەوان خڕکردباوە، هەر باوەڕیان نەدێنا، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێ ﴾[5].

---

١ يس: ١٢

٢ الطور: ١

٣ الزخرف: ٤.

٤ التكوير: ٢٩.

٥ الانعام: ١١١.

﴿ ولَوْ شاء ربُّكَ مَا فعَلوه: **ئەگەر خوا بیویستبا وایان نەدەكرد** ﴾[1].

﴿ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُـــونُ: **فەرمانی خوا ئەوەیە ئەگەر شتێكی بوێ پێی بڵێ ببە، دەسبەجێ دەبێ** ﴾[2].

﴿ مَنْ يَشَأِ اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَنْ يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِرَاطٍ مُسْـــتَقِيمٍ: **ئەوكەسەی خوا بیەوێ گومڕای دەكات، كێشی بوێ دەیخاتە سەر راستەڕێی ڕێنوێنی**﴾[3].

**ویست و توانای خوا لەو شتانەی بونە و دەبن پێكەوەن، بەڵام لەوشتانەی نەبونە و نابن لەیەك دادەبڕێن.**

**ئەوەی خوا بیەوێ ببێ ئەوا بەتوانای خوا هەر دەبێ و ئەوەی نەیەوێ ببێ نابێ، چونكە ویستی خودای لەگەڵ نیە، نەك لەبەر ئەوەی توانای نیە، خودا دەفەرموێ:**

﴿ ولَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُوا وَلَكِنَّ اللَّهَ يَفْعَـــلُ مَـــا يُرِيـــدُ: **گەر خوا ویستی لەسەربا نەیدەهێشت دەگژیەك راچن، بەڵام خودا بە خواستی خۆی كاران دەكا**﴾[4].

﴿ ولَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِـــدَةً: **ئەگەر خوا بیویستبا دەیكردنە یەك نەتەوە** ﴾[5].

﴿ ولَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْـــهُدَى: **ئەگەر خوا بیویستبا سەرجەمیانی لەسەر ڕێنوێنی كۆدەكردەوە** ﴾[6].

﴿ ولَوْ شَاءَ اللَّـــهُ مَـــا أَشْـــرَكُوا: **ئەگەر خوا بیویستبا هاوبەشیان پەیدا**

---

١ الأنعام: ١١١.

٢ یس: ٨٢.

٣ الانعام: ٣٩.

٤ البقرة:٢٥٣..

٥ المائدة: ٤٨ .

٦ الانعام ٣٥.

**نەدەکرد﴾**[1].

﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا: **ئەگەر خوا بیویستبا تەواوی خەڵکانی زەوی بڕوایان دەهێنا ﴾**[2].

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا: **ئەدی نەتدیوە پەروەردگارت چۆن سێبەری درێژ کردۆتەوە، ئەگەر بیویستبا وای دەکرد لەجێ نەبزوێ ﴾**[3].

**ئایەتی‌تر لەم بارەوە زۆرن کە بەڵگەن بۆ ئەوەی هەر شتێك خودا نەیویستبێ نەبوە، لەبەرئەوەی خوا ویستی لەگەڵدا نەبوە، نەك لەبەر ئەوەی توانستی پێدا نەشکابێ، چونکە خوا توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە.**

**پایەی چوارەم/ بڕوابون بەوەی کە خودا بەدیهێنەری هەموشتێکە.**

**لەچەندین ئایەتدا هاتوە کە خوا بەدیهێنەری هەموشتێکە، خوا بەدیهێنراوانی بەدیهێناوەو پەیدای کردون، کە تەنها ئەو خودایەو بێ لەوەی هەر هەمویان بەندەی خوان.**

﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ: **خودا بەدیهێنەری هەمو شتێکە ﴾**[4].

﴿وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ: **پەروەردگارت بەدیهێنەرو فرەزانایە ﴾**[5].

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ: **سوپاس بۆ خودا کە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێناوەو روناکیو تاریکی فەراهەم هێناوە﴾**[6].

---

١ الأنعام ١٠٧.

٢ يونس ٩٩.

٣ الفرقان ٤٥.

٤ الزمر ٦٢

٥ يس ٨١.

٦ الأنعام ١.

﴿ يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً: خەڵکینە لەخودا بترسن کە ئێوەی لەتاقە کەسێك بەدیهێناوە کە هەر لەو کەسەش هاوسەرەکەی بەدی‌هێناوەو پاشان لەوانەوە ژن و پیاوێکی زۆری لێ پەیداکردن ﴾[1].

﴿ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ: هەرخودا شەو رۆژو خۆرو هەیڤی بەدیهێناوە، هەر هەمویان لەخولگەی ئاسمانێدا مەلە دەکەن و دەسورێنەوە ﴾[2].

زۆر ئایەتی تریش لەم بارەوە هەن.

---

[1] النساء ١

[2] الأنبياء ٣٣

# جێباسی چوارەم

## کردەوەی بەندەکان بەدیهێنراو و خەمڵێنراوە

بەندەکان و کردەوەکانیشیان لە بەدیهێنراوەکانی تر جیاواز نین، خودا زانیویێتی چ بەدیدەهێنێ و بەدیهێنراوەکانیش چ کردەوەیەك دەکەن، هەمو زانینەکانیشی لەتەختی پارێزراودا نوسیوە، خودا چۆنی ویستوە ئاوەهای بەدیهێناون و قەدەری خوایان لەسەر جێبەجێ بوە، وەکو خوا ویستویەتی کردەوەکانیان ئەنجام داوە، ئەو کەسەی خودا ئاسودەیی بۆ نوسیوە رێنوێن بوەو ئەو کەسەش کە بەدبەختی بۆ نوسیوە گومڕا بوە، زانیویێتی کێ بەهەشتیەو کردەوەکانی بۆ ئاسان کردوەو زانیویێتی کێ دۆزەخیەو کردەوەکانی بۆ ئاسان کردوە.

ئەو ئایەت و فەرمودانەی لەپێشتردا هێنامانن‌ەوە بەڵگەی گوتەکانی سەرەوەمان بۆ بەدەستەوە دەدەن، بەڵام هەندێ دەقی تر دێنینەوە کە راشکاوانەتر لەم بارەوە بەڵگە بدەن.

خودا دەفەرموێ:

﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ: خودا خۆتان و کردەوەکانتانی بەدیهێناوە﴾[1]

﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ: هەرچی کردویانە، لە تەختی پارێزراودا نوسراوە ﴾[2]

﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلاَ تَضَعُ إِلاَّ بِعِلْمِهِ وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلاَ يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلاَّ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ: هیچ مێینەیەك دوگان نابێت و

---

١ الصافات: ٩٦

٢ القمر: ٥٢

ـسکەکەی دانانێت مەگەر بە زانستی ئەو، وە تەمەنی هیچ کەس(زیاد نابێ) و ـگاتە پیری و لە تەمەنی کەسێ کەم نابێ مەگەر ئەوەی کە هەموی لە کتێبدا زانستی خوا) نوسراوە، بەراستی ئەم کارانە بۆ خوا ئاسانە ﴾[1].

﴿ مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي وَمَنْ يُضْلِلْ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ: ـەوانەی خودا ڕێنوێنیان دەکات ڕێنوێنن، بەڵام ئەوانەی گومڕایان دەکات ـەریزی زیانبارانە ﴾[2].

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ: پەروەردگارت لەو کەسانەی لە ڕێگەی ئەو لایانداوە لە گشت کەس ئاگادارترە و هەرخۆیشی باشتر دەزانێ کێ لەسەر ڕاستەڕێیە﴾[3].

زۆر فەرمودەش بەتەواتور هاتون و واتاکانیان ئەوە دەگەیەنن کە خودا زانیویێتی بەندەکان چ دەکەن، ئەندازەی گرتوەو بڕیاری داوەو لێبۆتەوەو زانیوێتی کام بەندە بەبەختەوەری یان بەبەدبەختی دەگات و ڕاشی گەیاندوە ـەگەڵ هەمو ئەوانەدا قەدەری خوا نابێتە بەربەستی کردەوان: ((اعملوا فکل ـیسر لما خلق لە: کردەوەی چاك بکەن چونکە هەرکەسێك ئامادەدەکرێ بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی خوڵقێنراوە)).

لێرەدا هەندێك لەو فەرمودانە دەخەینە ڕو:

**ئەو دەقانەی وا دەگەیەنن خودا کردەوەی بەندەکانی خەملاندوە:**

١- ئەو فەرمودانەی لەسەر ئەوە بەڵگەن کە کردەوەکانی بەندە نوسراوەو قەزاو قەدەر تێیەڕیوە:

جابر دەڵێ: سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشەم هاتە لای پێغەمبەرﷺ و

---

[1] فاطر: ١١

[2] الاعراف ١٧٨

[3] النحل ١٢٥

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دینمان بۆ رون بکەوە وەك ئەوەی تازە خەلق کرابین، ئێمە لەچدا کردەوەی چاکەو خراپە دەکەین، لەوەدا کە قەلەم نوسیویەتیو مەرەکەبەکەی وشك بۆتەوەو قەزاو قەدەر وا رابوریوە، یاخۆ لەمەولا هەرکەس بەکەیفی خۆی چاکەو خراپە دەکات؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لا، بل فيما جفت به الأقلام وجرت به المقـادير: نەخێر بەڵکو لەوەدا کردەوەی چاکەو خراپە دەکەین کە قەڵەم نوسیویەتیو قەزاوقەدەر بڕیاری لەسەر داوە)).

گوتی: کەواتە بۆچی کردەوان بکەین؟

فەرموی: ((اعملو فكلٌ ميسر: کردەوەی چاکە بکەن، هەرکەسێك بۆچی بەدیهێنراوە ئەوەی بۆ ئاسان دەکرێ))، لەبێژانەوەیەکی تردا دەڵێ: (كل عامل ميسَّر لعمله: هەمو کارکەرێك کردەوەکەی بۆ ئاسان دەکرێ).[1]

عومەری کوڕی خەتتاب لە پێغەمبەر ﷺی پرسی: ((یارسول الله ارايت ما نعمل فيه: امر مبتدع او مبتدأ، أم فيما فرغ منه؟ فقال: فيما فرغ منه يا ابن الخطاب، وكل ميسَّر، أما من كان من اهل السعادة فانه يعمل للسعادة، وأما من كان من أهل الشقاء فإنه يعمل للشقاء: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کردەوانەی ئێمە دەیکەین لەدەرەوەی قەزاو قەدەرە یان تازە بڕیاری قەزاوقەدەری لەسەر دەدرێو یان بڕیاری قەزاوقەدەری لەسەردراوە؟ فەرموی بڕیاری لەسەر دراوەو هەمو کەسێکیش ئەو کردەوەیەی بۆ ئاسان دەکرێت کە بۆی نوسراوە، ئەگەر لەبەختەوەران بێ کاری بەهەشتیانە دەکات، ئەگەر بەدبەختیش بێ ئەوا کردەوەی دۆزەخیەکان دەکات))[2].

---

[1] رواه مسلم في صحيحه: (٤/٢٠٤٠)(٢٦٤٨)

[2] رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح: سنن الترمذي: (٤/٤٤٥)(٢١٣٥)

### ٢- زانیاری خـودا بەبەهەشـتیەکان و دۆزەخیـەکان:

عیمرانـی کـوڕی حوصـەین دەڵـێ: پیـاوێك گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ: بەهەشتیەکان و دۆزەخیـەکان جـودا بوینـەوە؟ فـەرموی: بـەڵێ. گوتـی: کـەوابێ بۆچی کردەوەی چاك بکەین؟ فەرموی: ((کل یعمل لما خلـق لـه، او ییسـر لـه: هەرکەسێ بۆچی بەدیهێنرابێو چی بۆ ئاسان کرابێ ئەوە دەکات))[1].

عـەلی (رەزای خـوای لێبـێ) دەگێڕێتـەوەو دەڵـێ: (بـۆ شـاردنەوەی تـەرمێك دەرچوبوین بۆ بەقیعولغەرقەد (کە گۆڕستانی خەڵکی مەدینە بو)، پێغەمبـەر ﷺ هاتـە لامـان و دانیشـت، ئێمـەش لـەدەوری دانیشـتین، چیلکـە دارێکـی پـێبو، بەماتـەمی سـەری خـۆی دانـەواندو بـە چیلکـە دارەکـەی لـەزەوی هێڵـی دەکێشـا، پاشان فەرموی: ((ما منکم من أحد، ما من نفس منفوسة، إلا وقد کتب الله مکانها مـن الجنة او النار، وإلا قد کتبـت شـقیة او سـعیدة: بۆ هـەموتان و بۆ هەمو کەسێك نوسراوە بەهەشتیە یان دۆزەخیە، نوسراوە ئایا بەدبەختە یان بەختەوەر)).

پیـاوێکیش گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا کەواتـە بۆچـی واز لـەکردەوان نـەهێنین و متمانە بکەینـە سەر ئەوەی بۆمـان نوسـراوە، چونکـە ئـەو کەسـەی بەختەوەر بێ کردەوەی بەختـەوەران ئەنجام دەدا، ئـەو کەسـەش بەدبەخت بـێ کردەوەی بەدبەختان ئەنجام دەدا؟!

فەرموی: ((اعملو فکل میسر، أمّا اهل السعادة فییسرون لعمل اهل السعادة، وأمـا أهل الشقاوة فییسرون لعمل أهل الشقاوة.. ثم قرأ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى﴾[2]: کردەوەی چاك بکەن چونکە بەختـەوەران کردەوەی بەختەوەرانیان بۆ ئاسان دەکرێت و دەیکەن، بەدبەختانیش کردەوەی بەدبەختانیان بۆ ئاسان دەکرێت و دەیکەن، ئەنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوەی کە

---

١ رواه البخاري

٢ الليل: (٥-١٠)

واتاکەی وایە: ئەوکەسەی ماڵ ببەخشێ و لەخوا بترسێ‌و کاری خراپ نەکا و بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە، ئەوا ڕێی چاکەی بۆ ئاسان دەکەین، بەڵام ئەوکەسەی ڕەزیلی بکات و خۆی بێنیاز بزانێت و بڕوای بە پاداشتی خوا نەبێت و بەدرۆی بزانێت، ئەوا ڕێگەی خراپەکردنی بۆ ئاسان دەکەین))[1].

٣- دوای بەدیهێنانی ئادەم خوا نەوەکانی لەپشتی ئادەم دەرهێناوەو کردونی بەدو کۆمەڵ؛ بەهەشتی‌و دۆزەخی:

پێغەمبەرمان ﷺ پێی ڕاگەیاندوین خودا کە ئادەمی بەدیهێنا، دەستی بەپشتی داهێناو نەوەکانی لە پشتیەوە وەك گەرد و گێرکە دەرهێناو پاشان دۆزەخی‌و بەهەشتیەکانی جیاکردەوە.

موسلیمی کوڕی یەسار دەڵێ: لەبارەی ئەم ئایەتەوە لەعومەری کوڕی خەتتابیان پرسی (ڕەزای خوای لێبێ) کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ: کاتێ پەروەردگارت لە نەوەی ئادەم پەیمانی وەرگرت، هەمو نەوەکانی پشتاوپشتی کۆکردەوە (لەجیهانی پەنهاندا)، (کاتێ هاتنە) مەیدانی بون، کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە (پێی فەرمون) ئایە من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەمو گوتیان: بەڵێ شایەتین، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لەڕۆژی قیامەت بڵێن: ئێمە ئاگامان لە شتی وا نەبوە!!﴾[2].

عومەر گوتی: گوێم لێبو پێغەمبەر ﷺ کە لەبارەی ئەم ئایەتەوە لێیان پرسی، فەرموی: ((ان الله خلق آدم، ثم مسح ظهره بيمينه، فاستخرج منه ذريته، فقال: خلقت

١ رواه مسلم: (٤/٢٠٣٩) رقم(٢٦٤٧) والحديث رواه البخاري في غير موضع في صحيحه ورواه الترمذي وابوداود واللفظ الذي سقناه لمسلم.

٢ الاعراف ١٧٢

هؤلاء للجنة. وبعمل اهل الجنة يعملون، ثم مسح ظهره، فاستخرج منه ذرية، فقال خلقت هؤلاء للنار، وبعمل اهل النار يعملون: **خودا كە ئادەمی بەدیهێنا دەستی راستی بەپشتی داهێناو نەوەكانی دەرهێنا، فەرموی: ئەوانەم بۆ بەهەشت بەدیهێناوەو كردەوەی بەهەشتیان دەكەن، پاشان دەستی بەپشتی داهێناوەو نەوەكانی دەرهێناو فەرموی: ئەوانەم بۆ دۆزەخ بەدیهێناوەو كردەوەی دۆزەخیانیش ئەنجام دەدەن))**.

**دەڵێ: پیاوێكیش گوتی: كەواتە بۆچی كردەوە بكەین؟**

**پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((ان الله اذا خلق العبد للجنة استعمله بعمل اهل الجنة، حتى يموت على عمل من اعمال اهل الجنة، فيدخله به الجنة.. واذا خلق العبد للنار، استعمله بعمل اهل النار، حتى يموت على عمل من اعمال اهل النار، فيدخل به النار: **خودا ئەگەر بەندەیەك بۆ بەهەشت بەدیبهێنێ وای لێدەكات كردەوەی بەهەشتیان بكات، تا لەسەر كردەوەیەكی بەهەشتیان دەمرێو دەچێتە بەهەشت. وە ئەگەر بەندەیەك بۆ دۆزەخ بەدیبهێنێ وای لێ دەكات كردەوەی دۆزەخیەكان ئەنجام بدات تا لەسەر كردەوەیەكی دۆزەخیەكان دەمرێ و دەخرێتە دۆزەخ))**[1].

**ئیبنو عەباس** (رەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((اخذ الله الميثاق من ظهر آدم بنعمان –يعني عرفه– فأخرج من صلبه كل ذرية ذرأها، فنثرهم بين يديه كالذر، ثم كلمهم قبلا قال: ﴿... أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ، أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ﴾[2]: **خودا لەعەرەفەدا بەڵێنی لەپشتی ئادەم وەرگرت، هەمو نەوەكانی لەپشتی دەرهێنا كە بەدیهێنابون، لەنێو**

---

١ رواه مالك والترمذي وابوداود. مشكاة المصابيح (٣٤/١) رقم(٩٥) وقال محقق المشكاة الشيخ ناصرالدين الالباني فيه: رجال اسناده ثقات رجال الشيخين، غير أنه منقطع بين مسلم بن يسار وعمر، لكن له شواهد كثيرة.

٢ الاعراف ١٧٢-١٧٣

دەستەکانیدا وەکو گەرد و گێرکان پەرشوبڵاوی کردنەوە، ئەنجا قسەی لەگەڵدا کردن و فەرموی: ئەدی من پەروەردگارتان نیم، گوتیان بەڵێ گەواهی دەدەین، کەواتە لەرۆژی قیامەتێدا نەڵێن ئاگامان لەوە نەبوە، یان بڵێن: پێشتر باوانمان بێبڕوا بون و هاوبەشیان پەرستوە، ئێمەش لەدوای واندا بوینە نەوەیان و هاوبەشپەرست دەرچوین، بڵێن: بۆ بەهۆی کردەوەی باوانی پێشتر سزامان دەدەی کە ئەوان هۆی گومڕایی ئێمە بون ))[1].

ئەبو دەرداء(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((خلق الله آدم حين خلقه، فضرب كتفه اليمنى، فأخرج ذريته بيضاء كأهم الذر، وضرب كتفه اليسرى فأخرج ذرية سوداء كأهم الحمم، فقال للذي في يمينه: الى الجنة ولا ابالي، وقال للذي في كتفه اليسرى: الى النار ولا ابالي: خودا کە ئادەمی بەدیهێنا، دەستێکی لەلا شانی راستەی دا، هەندێ نەوەی سپی دەرهێنا وەکو گەردو گێرکە پەرشوبڵاو بون، هەروەها دەستێکی لە لاشانی چەپەی دا، هەندێ نەوەی رەشی دەرهێنا وەکو خەڵوز بون، بەئەوانەی فەرمو کە لەلای راستی بون: بۆ بەهەشت و بێ باکم، بەئەوانەشی فەرمو کە لە لای چەپی بون: بۆ دۆزەخ و بێباکم))[2].

پێغەمبەر ﷺ لەفەرمودەیەکیتردا دەفەرموێ: ((أنَّ الله ﷻ خلق خلقه في ظلمة، فألقى عليهم من نوره، فمن اصابه من ذلك النور اهتدى، ومن أخطأه ضل، فلذلك اقول جف القلم على علم الله: خودا بەدیهێنراوانی لەتاریکیەکدا بەدیهێنا، پاشان هەندێ لەروناکی خۆی بۆ هەڵدان، ئەوەی وەبەر ئەو روناکیە کەوت رێنوێن بو، ئەوەی وەبەریش نەکەوت گومڕا بو، بۆیە دەڵێم مەرەکەبی قەڵەم لەسەر زانستی خوا وشك بۆوە))[3].

---

١ رواه الإمام احمد في مسنده باسناد صحيح: مشكاة المصابيح (٤٣/١)

٢ رواه احمد في مسنده بأسناد صحيح: مشكاة المصابيح (٤٢/١)

٣ رواه الترمذي عن عبدالله بن عمرو وقال فيه: هذا حديث حسن: (٢٦/٥) رقم(٢٦٤٢).

**٤- نوسینی ناوی بەهەشتیو دۆزەخیەکان لەلایەن خوداوە:**

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص** (ڕەزای خوایان لێبێ) **دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، دو کتێبی پێبو، فەرموی: دەزانن ئەم دو کتێبە چیە؟ گوتمان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا! پێمان ناڵێی چیە؟**

**بەکتێبەکەی دەستی ڕاستی فەرمو:** ((هذا كتاب من رب العالمين، فيه اسماء اهل الجنة واسماء آبائهم وقبائلهم، ثم أُجمل على آخرهم، فلا يزاد فيهم، ولا ينقص منهم ابدا: **ئەم پەرتوکە لەلای خوای پەروەردگارەوەیە، ناوی هەمو بەهەشتی و باوان و هۆزەکانیانی تێدایە، ناوی سەرجەم بەهەشتیەکانی تێدا نوسراوە، نەلێیان کەم دەبێتەوەو نە لێشیان زیاد دەبێ)).**

**بەکتێبەکەی دەستی چەپیشی گوت:** ((هذا كتاب من رب العالمين، فيه اسماء اهل النار، وأسماء آباءهم وقبائلهم، ثم اجمل على آخرهم، فلا يزاد فيهم ولا ينقص منهم ابدا: **واتە ئەم پەرتوکە لەلای خودای پەروەردگارەوەیە، ناوی هەمو دۆزەخیو باوان و هۆزەکانیانی تێدایە، ناوی سەرجەم دۆزەخیەکانی تێدا نوسراوە، نەلێیان کەم دەبێتەوە نەلێیان زیاد دەبێ))..**

**یاوەران گوتیان: مادەم ئەوە دیاری کرابێ بۆچی کردەوەی چاك بکەین؟**

**فەرموی:** ((سدّدوا وقاربوا، فإنَّ صاحبَ الجنةِ يختم له بعمل اهل الجنة وإن عمل أي عمل. وإنَّ صاحب النار يختم له بعمل اهل النار وإن عمل أي عمل: **ڕاست بلێن و ڕاست بڕۆن، ئەوەندەی پێتان دەکرێ هەوڵ بدەن. چونکە یەکێك بەهەشتی بێ، مۆری کۆتایی کردەوەکانی بەهەشتیانەیە، جا هەرچیەکی کردبێ، دۆزەخیەکەش هەروا)).**

**پاشان کتێبەکانی فڕێداو فەرموی:** (( فرغ ربكم من العباد فريق في الجنة وفريق في السعير: **خودا لەکاری بەندەکانی بۆتەوە، چینێکیان لەبەهەشتەو چینەکەیتر لەدۆزەخە))**[1].

---

١ سنن الترمذي: (٤/٤٥٠) رقم(٢١٤١)قال الترمذي: هذا حديث حسن غريب صحيح. هەروەها لە صحيح سنن الترمذي شيخ ناصر دایە بەژمارەی (٢/٢٢٥).

## ٥- خەملاندنی شەوی قەدرو خەملاندنی رۆژانە:

پێشتر رونمان کردەوە کەخودا پێش پەنجا هەزار ساڵ بەر لەوەی ئەرزو ئاسمانەکان بەدیبهێنێ، قەزاو قەدەری نوسیوەو براندۆتەوە. جا لەگەڵ ئەمەشدا لە قورئان و سوننەتدا هاتوە؛ دو خەملاندنی تر هەیە: یەکێکیان ساڵانەیە ئەوەی تریان رۆژانەیە.

خەملاندنی ساڵانە لەشەوی قەدردا دەبێ، لەم شەوەدا رێژەی مەرگ و ژین و بژێویو باران و کردەوەی بەندەکانی ئەو ساڵە کە بەگوێرەی نوسراوەکەی سەر تەختی پارێزراو دەنوسرێتەوە.

خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ، فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ، أَمْرًا مِنْ عِنْدِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ: لەشەوی قەدردا کە شەوێکی پیرۆزە قورئانمان دابەزاندوە، بەراستی ئێمە بێدارکەرەوەین، لەو شەوەدا هەمو کارێکی بەجێ و دانایی تیادا لەیەك جیاکراوەتەوە، فەرمان لەلای خۆمانەوە دادەبەزێ و ئێمە پەیامبەران دەنێرین.﴾[1].

خەملاندنی رۆژانەش ئەوەیە کە خەملاوەکان لەو کاتانەدا دادەبەزن کە پێشتر ئەندازەیان بۆ دیاریکراوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ: هەرکێ لەناو ئاسمانەکان و زەمینن، هەموو کارێکیان هەر بەوەو ئەو گشت رۆژێ بەکارێکەوە خەریکە﴾[2].

مونیبی کوڕی عەبدوڵلا لەباوکی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (شأن) چیە؟ فەرموی: لەگوناح دەبورێ، تەنگانە لا دەدات، کەسانێك بەرز دەکاتەوە،

---

١ الدخان ٣-٥

٢ الرحمن ٢٩

کەسانێك نزم دەکاتەوە[1].

تێکرای لێکدانەوەکەی تەفسیری زانایان لە شەئنی خودا ئەوەیە کە: (ڕۆژانە دەمرێنێ و دەژێنێ، بەدیبێنێ و بژێوی دەبەخشێ، کەسانێك سەربەرز دەکات و کەسانێکیش سەرنزم. نەخۆشان چاك دەکاتەوە، گرفتاران رزگار دەکات، تەنگانە لادەدات، وەڵامی نزاکاران دەداتەوە، بەداواکاران دەبەخشێ، لەگوناحان خۆش دەبێ، ئیتر هەمو ئەو کردەوەو کارانەی بۆ بەدیهێنراوانی دەکات کە لە هەژمارکردن نایێن[2].

٦- نوسینی قەزاو قەدەری هەر مرۆڤێك کە هێشتا کۆرپەلەیە:

لەفەرموداندا هاتوە کە خودا فریشتەیەك بۆلای کۆرپەلەی ناو منداڵدان دەنێرێ، بژێویو ئاکام(أجل) و نەگبەتیو بەختەوەری بۆ دەنوسێ.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

((إن أحدكم يجمع في بطن امه اربعين يوما، ثم يكون علقة مثل ذلك، ثم يكون في ذلك مضغة مثل ذلك، ثم يرسل الملك فينفخ فيه الروح، ويؤمر بأربع كلمات: بكتب رزقه وأجله وعمله وشقي أو سعيد، فوالذي لا إله غيره، إن أحدكم ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب، فيعمل بعمل أهل النار، فيدخلها، وإن أحدكم ليعمل بعمل أهل النار، حتى ما يكون بينه وبينها إلا ذراع، فيسبق عليه الكتاب، فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخلها: هەرکامێکتان کە لەناو زگی دایکتان چل ڕۆژ دەمێننەوە، پاشان دەبێتە زەرو، پاشان وەکو پشکە گۆشتێکی جوراوی لێدێت، پاشان خودا فریشتەیەك دەنێرێ روحی پێدا فو دەکات و بەچوار وشان فەرمانی پێ دەکرێ؛ نوسینی بژێویو ئاکام و کردەوەکەیو بەدبەختی یان بەختەوەرییەکەی. بەو خودایەی

---

١ رواه ابن جرير

٢ خاوەنی معارج القبول: (٢/٣٤٦) لە ئەلبەغەوی تەفسیرزانی هێناوەتەوە.

**بێ شەریکە، هی واتان هەیە کردەوەی بەهەشتیان دەکات تا یەك باڵی دەمێنێ بچێتە بەهەشت، بەڵام نوسراو پێشی دەداتەوەو کردەوەی دۆزەخیان دەکات و دەچێتە دۆزەخ. هی واشتان هەیە کردەوەی دۆزەخیان دەکات تا یەك باڵی دەمێنێ بچێتە ناوی، بەڵام قەزاوقەدەری نوسراو پێشی دەداتەوەو کردەوەی بەهەشتیان دەکات و دەچێتە بەهەشت))**[1].

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((وكّل الله بالرحم ملكا، فيقول: أي رب نطفة، أي رب علقة، أي رب مضغة، فاذا أراد الله ان يقضي خلقها قال: أي رب ذكر أم أنثى، أشقي أم سعيد؟ فما الرزق؟ فما الأجل، فيكتب كل ذلك في بطن أمه: **خودا فریشتەیەکی بەمنداڵدان تەرخان کردوە، دەڵێ: خوایە دڵۆپە ئاوە، خوایە زەروە، خوایە بوە گۆشت پارە، جا کە خوا ویستی بڕیاری بەدیهێنان بدات، دەڵێ خوایە نێر بێ یان مێ، بەدبەخت بێ یان بەختەوەر؟ بژێوی چۆن بێ؟ تەمەنی چەند بێ؟ ئەوانەی هەرهەمو هێشتا هەر لەزگی دایکیدایە بۆ دەنوسرێ))**[2].

**ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((إذا اراد الله بعبد خيرا استعمله، فقيل كيف يستعمله يا رسول الله؟ قال: يوفقه لعمل الصالح قبل ان يموت: **ئەگەر خودا بیەوێ بەندەکەی چاك بێ دەیخاتە بەرکار. گوتیان چۆن دەیخاتە بەرکار ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: بەرلەوەی بمرێ دەیخاتە سەر کرداری چاك))**[3].

**ئەبو هورەیرە**(ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:**

((إن الرجل ليعمل الزمن الطويل بعمل أهل الجنة، ثم يختم له عمله بعمل أهل النار،

---

١ رواه البخاري. فتح الباري: (٤٧٧/١١) ورواه مسلم (٢٠٣٦/٤) رقم(٢٦٤٣) والسياق لمسلم ورواه ابوداود والترمذي ايضا.

٢ رواه البخاري: فتح الباري (٤٧٧/١١) ورواه مسلم (٢٠٣٨/٤) رقم(٢٦٤٦) والسياق للبخاري.

٣ رواه الترمذي وقال: هذا حديث حسن صحيح. سنن الترمذي (٤٥٠/٤) ورقمه(٢١٤٢)

وإن الرجل ليعمل الزمن الطويل بعمل أهل النـــار، ثم يختـــم لـــه بعمـــل أهـــل الجنـــة:

**پيـــاو هەيـــە ماوەيـــەكى دوورودريـــژ كـــردەوەى بەهەشـــتيان دەكـــات، بـــەلام لەكۆتاييەكـەيدا كـردەوەى دۆزەخيـان دەكـات. پيـاويش هەيـە بەپێچەوانـەوە رۆژگـارێكى دوورودرێـژ كرەوەى دۆزەخيـان دەكات بـەلام لـەئاخرو ئۆخرەكـەيدا كردەوەى بەهەشتيان دەكات و دەچێتە بەهەشت)).[1]**

**سـەهلى كـوڕى سـەعدى سـاعيدى**(رەزاى خـواى لێبـێ) **دەڵـێ پێغەمبـەرﷺ فەرموى:** ((ان الرجل ليعمل بعمل اهل الجنة فيما يبدوا للناس وهو من اهل النـــار، وان الرجل ليعمل بعمل اهل النار فيما يبدو للناس وهو من اهل الجنة)[2].

**ئەم رووداوەش پەندو ئامۆژگارێكى كاريگەرى تێدايە كە سەهلى كوڕى سەعد دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پياوێك لە غەزايەكدا لەهەمو موسڵمانان شەڕێكى گەرمترى دەكـرد، پێغەمبـەر ﷺ فـەرموى: كـێ دەيـەوێ تەماشـاى دۆزەخيـەك بكـات بـا تەماشاى ئەو كابرايە بكات.**

**موسڵمانيكيش چاوى دابوە ئەو كابرايەو دەيويست بزانێ كۆتاييەكەى بەچ دەگات، شەڕێكى زۆر توندوتيـژو گـەرمى دەكرد تـا برينـدار بـو، ئارامى لەسەر ئازارى برينەكەى نەگرت بۆيە نوكى شمشـێرەكەى لـەنێوان هـەردو مـەمكانى داناو خۆى بەسەر دادا تا لەپشتى هاتە دەرێو خۆى كوشت.**

**موسـڵمانەكە بەپەلـە هاتـەوە لاى پێغەمبـەر ﷺ و گـوتـى: شـاهێدى دەدەم تـۆ پێغەمبەرى خواى.**

**فەرموى: چ بوە؟**

**گـوتـى: بـەفلان كەسـت گـوت كـێ حـەز دەكـا تەماشـاى دۆزەخيـەك بكـات بـا تەماشـاى ئـەو كابرايـە بكـات، منيـش دەمـدى لەهـەمومان زيـاتر بـەرگرى لـە موسڵمانان دەكرد، بەلام زانيم ئاوەها نامرێ، جا كە بريندار بو، ئارامى نەگرت**

---

١ رواه مسلم: (٤/٢٠٤٢) رقم الحديث(٢٦٥١)

٢ رواه مسلم: (٤/٢٠٤٢)

**و خۆی کوشت.. پێغەمبەرﷺ فەرموی:** ((ان العبد ليعمل عمل اهل النار، وانه مـــن اهل الجنة، ويعمل عمل اهل الجنة، وانه من اهـــل النـــار، وانمـــا الأعمـــال بـــالخواتيم: **بـەندەی واهەیـە کـردەوەی دۆزەخیـان دەکـات و بەهەشـتیە، هـیواش هەیـە کـردەوەی بەهەشـتیان دەکـات و دۆزەخیـە.. بەراسـتی کۆتـایی کردەوەکـان پێوەرە)).**[1]

1 رواه البخاري عن أبي حازم عن سهل بن سعد. فتح الباري: (١١/٤٩٩) رقم(٦٦٠٧).

# بەندی چوارەم

## سنوری عەقڵی مرۆڤ لەئاست قەدەردا

ئەبولموزەفەری سەمعانی کە ئیبنوحەجەری عەسقەلانی لێی دەگێڕێتەوە گوتویەتی: (ڕێگەی ناسینی ئەو بابەتە، هەڵوەستە کردنە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا بێئەوەی پێوانەکاری تێدا بکرێ. ئەو کەسەی لەو هەڵوەستەیە بترازێ دەکەوێتە گەرداوی داماویی‌و سەرگەردان دەبێ، ناگاتە ئەوەی چاوی تێر ببێ‌و دڵی ئاوێ ناخواتەوە، چونکە قەدەر نهێنیەکی خوایە، خودای زاناو شارەزا بەخۆی تایبەت کردوەو لەبەدیهێنراوانی پەردەپۆش کردوەو لەعەقڵ‌و زانیاری خەڵکی شاردۆتەوە، ئەوەش لەبەر ئەو حیکمەتەی کە خۆی دەیزانێ، بۆیە پەیامبەران و فریشتە نزیکەکانیش نایزانن)[1].

طەحاوی (رەحمەتی‌خوای لێبێ) دەڵێ: (قەدەر خۆی لەبنەڕەتدا نهێنیەکی خودایە، فریشتە نزیکەکان و پەیامبەرە ناودارەکانیش نایزانن، تێدا قوڵبونەوەشی سەردەکێشێ بۆ ریسوایی، چونکە وەك پەیژەیەکە بۆ بێبەشبون وەك پلەیەکە بۆ یاخیبون. ئاگاداربن، زۆر ئاگاداربن لێی ورد مەبنەوە، بیری لێمەکەنەوە، ئەرێ‌و نەرێ نەتانگرێ، چونکە خودا زانستی قەدەری لەبەندەکانی شاردۆتەوە، نەهی لەوە کردوە کە بەنیازی خوا هەڵبچنەوە. وەکو دەفەرموێ: ﴿ لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ: چی ئەو بیکا ناشێ پرسیاری لێبکرێ و ئەوانن کە بەرپرسیارن.﴾[2])[3].

---

١ فتح الباري: (٤٧٧/١١) بگەڕێوە بۆ شرح النووي على مسلم: (١٩٦/١٦).

٢ الأنبياء: ٢٣

٣ شرح الطحاوية: ل٢٧٦.

ئاجوری دەڵێ: (باش نیە موسڵمانان لەقەدەر بکۆڵنەوەو لێی قوڵ ببنەوە، چونکە قەدەر نهێنیەکی خودایە، بەڵکە واجبە بڕوات بەقەزاوقەدەری دیاریکردنی خێرو شەڕ هەبێ، بەلام رەنگە یەکێك لەقەدەر بکۆڵێتەوە توشی ئەوەبێ بڕوای پێ نەمێنێو لەراستەڕێ گومڕا ببێ)[1].

ئیمام ئەحمەد (رەحمەتیخوای لێبێ) دەڵێ: (لەسوننەتدا پێویستە بڕوا بەقەدەری خێرو شەڕ بێنین و ئەو فەرمودانەی لەبارەی قەدەریشەوە هاتون بەراستیان بزانین و بڕوایان پێ بێنین، نابێ بگوترێ: بۆچی؟ چۆن؟ دەبێ تەنها بەراستیان بزانین و بڕوایان پێ بێنین.

ئەوەی راڤەی فەرمودانیش نەزانێ و لێیان تێنەگاو ئەقڵی پێیاندا نەشکێ، ئەوەندەی بۆ بەسە کە بڕوایان پێ بێنێو گوێڕایەڵیان ببێ وەك فەرمودەکەی[2] (الصادق المصدوق)و فەرمودە هاوشێوەکانی لەقەدەردا[3].

عەلی کوڕی ئەلمەدینیش دەربارەی قەدەر هەمان قسەی ئیمام ئەحمەدی گوتوە[4].

**زانایان بەگوێرەی قسەکانیان چەند بنچینەیەکی ئەوپەڕی گرنگمان بۆ بڕیار دەدەن:**

**یەکەم: واجبێتی بڕوابون بەقەدەر.**

**دووەم:** ناسینی سنور و رەهەندەکان(أبعاد)ی قەدەری خوا بەپێی قورئان و سوننەت بێ، نەك بەلێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی عەقڵ و پێوانەکاریی بێ. چونکە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێ ئەو ئەدگارو ئەستون(رکائز)انە دیار بکات کە لە لاڕێبون و گومڕایی دەربازی دەکەن. ئەوانەی بەعەقڵی خۆیان لەو بابەتە قوڵ بونەوە

---

١ ألشریعة للآجري: ل٤١٩.

٢ ئەو فەرمودەیەی دەڵێ: (ان احدکم یجمع في بطن امه اربعین یوما . تادوایی. (وەرگێڕ)

٣ شرح اصول اعتقاد اهل السنة: ل١٥٧.

٤ هەمان ژێدەر ل١٦٥.

توشی گومڕایی‌و سەرگەردانی بون، هەیانە بڕوای بەقەدەر نەماوەو بەدرۆی زانیوە، هەیانە وایزانیوە قەدەر تۆبزکارییەو شەرعی خوای پێ بەتاڵ کردۆتەوە. هەر یەك لەوانە کۆمەڵێك گرفتی خستۆتە نێو ژیان و واقیعی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، چونکە لاڕێبون لەبیروباوەڕدا دەبێتە هۆی لاڕێبونی ئاکارو رەفتاری مرۆڤ لەواقیعی ژیانیدا.

**سێیەم**: قوڵنەبونەوەو لێنەکۆڵینەوە لە بابەتەکانی قەزاوقەدەر. چونکە هەندێ بوار هەیە عەقڵی مرۆڤ هەرچەندی پێگەیشتو بێ هەرسی ناکات.. هەندێ بواری‌تر هەیە زۆر بە زەحمەت ئەوجا ئەگەر هەرسی بکات.

رەنگە بگوترێ: ئەدی ئەوە وشك کردنەوەی بیر و عەقڵی مرۆڤ نیە؟ دەڵێین نەخێر. وشك کردنەوە نیە بەڵکو پاراستنی عەقڵە تا هێزو بڕستی خۆی لەشتێك بەفیڕۆ نەدات کە دادی نادات.

ئیسلام ئەدگارەکانی بڕوابون بەقەدەری خستۆتە بەردەستی مرۆڤ، بڕوابون بەقەدەر، ئەوەیە خودا هەمو شتێکی زانیوەو نوسیویێتی، ویستویێتی‌و بەدیهێناوە، عەقڵی مرۆڤیش بەئاسانی‌و بێ‌گرێ‌و گرفت و رەشکەو پێشکەو ئاڵۆزی، ئەم هەقیقەتانە لە ئامێز دەگرێ.

بەڵام شۆڕبونەوە بەقوڵایی قەدەرو لێکۆڵینەوەی نهێنیەکانی؛ دەبێتە مایەی پەرش و بڵاوبونەوەی وزەو بڕستی بیرو عەقڵ. تۆژینەوەو خەریکبون بەچۆنیەتی زانست و نوسین و ویستن و بەدیهێنان، لێکۆڵینەوەیە لە چۆنیەتی سیفەتەکانی خواو چۆنیەتی کارئەنجامدانی ئەم سیفەتانە. بەڵام ئەو شتە لە سنوری عەقڵی مرۆڤدا نیە، بەڵکو شتێکی پەنامەکی(غیب)ەو دەبێ بڕوامان پێی هەبێ. دروستیش نیە پرسیار لەحەقیقەتەکەیدا بکرێ. گەر یەکێك لێی بکۆڵێتەوە وەك ئەو کەسە وایە کە لەچۆنیەتی (ئیستوا)ی خودا بۆ سەر عەرشەکەی بکۆڵێتەوە. بەو جۆرە کەسانە دەڵێین: ئەو سیفەتانەی قەزاوقەدەری لەسەر هەڵنراوە واتاکانیان ئاشکرایە، چۆنیەتیان شاراوەیە، بڕواپێبونیان

واجبە، پرسیارو لێکۆڵینەوەش لەچۆنیەتیەکەیان بیدعەیە.

تـۆژەرەوان بـەهۆی ئـەوەی لـەبارەی چۆنیـەتی قەزاوقـەدەریان کۆڵیوەتـەوە توشی شەکەتیو ئەستەمیەکی زۆر هاتون و تۆژینەوەکەش زۆر قورس و ئاڵۆز بـوەو بـڕوا پێهێنـانی رەحمـەت کـردوەو بۆتـە مایـەی سـەرگەردانبونی زۆر لەتۆژەرەوان.

لەبـەر ئـەوە ژمارەیـەکی زۆر لـەزانایان روبـەری قەزاوقـەدەریان سـنور رێـژ کـردوەو گوتویانـە دروسـت نیـە کـەس ئـەم روبـەرە ببـەزێنێ. پێـش ئێسـتا گوتەیـەکی ئیمـام ئەحمـەدمان (رەحمـەتی خـوای لێبـێ) هێنایـەوە کـە دەڵـێ: (لەسوننەتدا پێویستە بڕوا بەقەدەری خێرو شەڕ بێنین و ئەو فەرمودانەش کە لەبارەی قەزاوقەدەرەوە هـاتون بڕوایـان پـێ بێنـین و بەراسـتیان بزانـین، کـەس نەپرسێ بۆچی و چۆن؟)[1].

تـۆژەرەوان لـەوەیان کۆڵیوەتـەوە کـەخودا چـۆن کـردەوەی بـەندەکان دەخولقێنێ لەکاتێکدا لەخودی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرن! لەچۆنیەتی زانستی خودایان کۆڵیوەتەوە کە ئاخۆ چۆن دەزانێ بەندەکان چ کردەوەیـەك دەکـەن؟ چۆن بەندەکانی بەکردەوە ئەرکبار دەکات کەچی خۆشـی دەزانـێ چ دەکـەن و چ ناکـەن و دەشـزانێ سـەرەنجامیان بەهەشـتە یـان دۆزەخ؟ ئـەوجا هەرچـەندی تەقـەلایان داوە هیچیـان بـەهیچ نـەکردوەو نـەیانتوانیوە ئایەتـەکان لەشـوێنی خۆیـاندا بـەکاربێنن و وەکـو خـوّی لێیـان بفـامن، بۆیـە هـەر بـەداماویو سەرگەردانی ماونەتەوەو نەگەیشتونەتە لێواری ئارامی دەریا. بۆیە پێغەمبەرﷺ ئاگاداری ئومەتەکەی کردۆتەوە لە گرتنەبەری ئەم رێڕەوە..

ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((خرج علينا رسول الله ﷺ ونحن نتنـازع في القدر، فغضب حتى احمرَّ وجهه، حتى كأنما فقيء في وجنتيه الرمان، فقال: أبهذا امـرتم، أم بهذا أرسلت إليكم؟ إنما هلك من كان قبلكم حين تنازعوا في هذا الأمر، عزمت عليكم الا

---

١ شرح اعتقاد اهل السنة للالكائي: (١٥٧/١).

تنازعوا فيـــــه: جارێك پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، ئێمەش مشتومڕو گفتوگۆمان لەبارەی قەزاوقەدەرەوە دەكرد، پێغەمبەرﷺ ئەوەندەمان لێ توڕە بو، لەتوڕەییان رەنگ و روی سور هەڵگەڕا وەك بڵێی دەنكە هەنار پڵقابێتە چاوی، فەرموی: باشە فەرمانتان پێكراوە مشتومڕ لەبارەی قەزاوقەدەر بكەن؟ یان من بۆ ئەوە رەوانە كراوم؟! نەتەوەكانی پێش ئێوە بەوە لەناوچون كە مشتومڕیان لەقەزاو قەدەر كردوە، بەتوندی فەرمانتان پێدەكەم واز لە مشتومڕ بێنن و لەو بارەوە پێدانەچن))[1].

**عـەقڵی مـرۆڤ تـا چ مەودایـەك دەتوانـێ لە پاسـاو و فـەرمان و كردەوەكـان و جوانیو دزێویـەكان بگـات؟!**

جەماوەری زانایانی پێشین و پاشین پێیان وایە فەرمان و بەدیهێنراوەكانی خوا هەریەكەو پاساو و حیكمەتی خۆی هەیەو خودا بەبێ حیكمەت هیچ فەرمانێك دەرناكات و بەبێ حیكمەتیش هیچ شتێ بەدیناهێنێ.

هەندێ لەم حیكمەتانە بۆ بەندەكان دەگەڕێتەوە، هەندێكیتری بۆ خوا دەگەڕێتەوە، ئەوەی تایبەتە بەبەندەكان درەنگ بێ یان زو قازانج و بەرژەوەندی بەندەكانی تێدایە، ئەوانەی تایبەتیشن بەخودا لەو سۆنگەوەیە كە خودا حەز دەكات بپەرسترێو گوێڕایەڵی بكرێو داوای لێخۆشبون و گیراكردنی پەشیمانبونەوەی لێبكرێو تەمای پێ بخوازرێو لێی بترسن و متمانەی پێبكەن و لەپێناویدا جیهاد بكەن.. خودا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: جنۆكەو مرۆڤم تەنها بۆ پەرستن بەدیهێناوە ﴾[2].

﴿ أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى: ئایا مرۆڤ پێی وایە بێ لێپێچانەوە

---

١ رواه الترمذي بأسناد حسن. صحيح سنن الترمذي: (٢/٢٢٣).

٢ الذاريات: ٥٦.

بەرهەڵدا بکرێ؟ ﴾[1].

﴿ وَمَــا أَرْسَــلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَــةً لِلْعَــالَمِينَ: تۆمان بەمیهرەبانی ناردوە بـۆ جیهانیان.﴾[2].

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَــا لاَ تُرْجَعُــونَ: پێتان وایە بەبێ مەبەســت و بــێهود ئێوەمــان بەدیــهێناوەو بــۆ لای ئێمــە ناگەڕێنــەوە تــا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکەین؟! ﴾[3].

ئەو ئایەتانەی ئاماژە بۆ حیکمەتەکانی فەرمان و بەدیهێنانی خوا دەکەن هێند زۆرن نایەنە هەژمار، عەقڵی مرۆڤ دەتوانێ هەر هەندێك لەو حیکمەتانە بزانێو هەستی پێ بکات.

جەماوەری زانایان پێیان وایە عەقڵ ئەوەشی لەتواناد‌ا هەیە بتوانێ پەی بەجوانیو دزێوی کردەوان ببات، عەقڵی مرۆڤ پەی بەوە دەبات و دەزانێ ســتەم و درۆو دزیو کوشــتن کــاری دزێــون، دەشــزانێ دادو راســتیو ئاشتکردنەوەی دو کەسی ناکۆك و رزگارکردنی خنکاوێك کاری جوان و چاکن.

**ئەو حیکمەتانەی لەشــەریعەتەکاندا هـەن سێ چەشنن:**

**یەکـــەم**: کردەوەکــە بــەرژەوەندی یــان زەرەرێکــی تێــدا بــێ، ئەگــەرچی لەشەرعیشدا نەهاتبێ، وەك ئەوەی کە دەزانین داد بەرژەوەندی خەڵکی تێدایە و ستەمیش زیانی خەڵکی تێدایە. ئەم چەشنە جوان.و دزێو (چاك و خراپ)انە هەم بەشەرع و هەم بەعەقڵیش بەم جۆرەن. بەڵام ئەگەر شەرع بڕیاری لەبارەدا نەدابێ عەقڵیش بەدزێوی بزانێ ئەوا لەرۆژی قیامەتدا سزای لەسەر نیە. بۆیە ئەوکەســەی بڵــێ خــودا ســزای موشــریك و بێبــاوەڕان دەدات ئەگــەرچی پەیامبەریشیان بۆ رەوانە نەکرابێ، ئەوا هەڵەی کردوەو نەیپێکاوە.

---

١ القيامة: ٣٦.

٢ الانبياء: ١٠٧.

٣ المؤمنون: ١١٥.

**دووەم:** ئەگەر شەرع فەرمانی بەشتێك كرد ئەوە جوانەو چاكە، ئەگەر بەرهەڵستی لێكرد ئەوە دزێو و خراپە، واتە كردەوەكە بەپێی بڕیاری شەرع سیفەتی چاك و خراپ وەردەگرێ.

**سێیەم:** خودای شەرعدانەر بەمەبەستی ئەزمون و تاقیكردنەوە فەرمان بەشتێك بكات، بەنمونە فەرمانی به پێغەمبەر ئیبراهیم كرد ئیسماعیلی كوڕی بكوژێتەوە، لێرەدا خودای شەرعدانەر مەبەستی سەربڕینەكە نەبوە، بەڵكو مەبەستی تاقیكردنەوەو ئەزمونی ئیبراهیم بوە.

موعتەزیلەكان تەنها دانیان بەچەشنی یەكەمدا ناوەو دووەم و سێیەمیش هیچ.

ئەشعەریەكان پێیان وایە سەرجەم فەرمان و بەرهەڵستیە شەرعیەكان لەچەشنی ئەزمون و تاقیكردنەوەن، كردەوەش نە پێش شەرع و نە بەشەرعیش سیفەتی چاك و دزێوی نیە.

بەڵام دانایان و سەرجەم جەماوەری زانایان هەرسێ چەشنیان سەلماندوە[1].

بەڵێ، جەماوەری یارانی رێباز(أهل السنة) بڕیاریان لەسەر ئەوەیە كە هەمو كردەوەكانی خوا پاساو و حیكمەتیان هەیە، عەقڵی مرۆڤیش دەتوانێ و لەباریدا هەیە چاك و خراپ و جوان و دزێوەكانیان بناسێ، ئەمەش دەرگای لێكۆڵینەوەو توێژینەوە دەخاتە سەرپشت تا عەقڵی مرۆڤ چەندی پێی دەكرێ لەحیكمەتە رۆشنەكان و پاڵنەرەكانی بەدیهێنراوان و ئەحكامە شەرعیەكان بكۆڵێتەوە، كە دەرگایەكی گەورەو بوارێكی فرەوانە، بەندەكان لەم رێیەوە زانستێكی فرە وەدەست دێنن و بڕوایان سەقامگیرتر دەبێ و یەقینیان پتەوتر دەبێ و داهێنان و كردەوە نایابەكانی خوا دەناسن ﴿ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ

---

١ لەم بابەتە بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوى شيخ الاسلام (٨/١٢٢،٣٠٨،٤٢٨) كە لەوێدا باسی پاساو و حیكمەتەكانی كردەوەكانی خواو بابەتی جوان و دزێوی ژیری دەكات.

خَلَقَهُ: ئەو خودایەی هەمو شتێکی بەوپەڕی ڕێکی و لەباری بەدیهێناوە ﴾[1].

جا چۆن وانابێ کە خودا بەڵێنی داوە نیشانەی گەورەو مەزن بۆ بەندەکانی ئاشکرا بکات کە مایەی بەراست دەرهێنانی ئیسلامە.

﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆکانی بونەوەردا و لەخودی خۆیانەوە پێ نیشان دەدەین، تا بۆیان دەرکەوێ ئەم قورئانە ڕاستە ﴾[2].

گەلێ ئایەتی تر لەم بارەوە هاتون کە مرۆڤ لەئایەتەکانی قورئان و لە نیشانەکانی گەردون ڕامێنێو وردبێتەوە:

﴿ أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ: ئەوە بۆچی لەقورئان ورد نابنەوەو ڕانامێنن ﴾[3].

﴿ قُلْ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ: پێیان بڵێ سەرنج بدەنە ئەرزو ئاسمانان بزانن ئاخۆ چیان تێدایە ﴾[4].

﴿ أَفَلاَ يَنْظُرُونَ إِلَى الإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ: ئەرێ تەماشای وشتر ناکەن چۆن بەدیهێنراوە ﴾[5].

﴿ فَلْيَنْظُرْ الإنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ، أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا، ثُمَّ شَقَقْنَا الأَرْضَ شَقًّا: با مرۆڤ تەماشای خواردنەکەی بکات و بزانێ چۆن فەراهەم هاتوە، ئێمە ئاومان بۆ ڕژاندۆتە خوارەوە و باراندومانە، پاشان زەویمان لەتلەت و قاژقاژ کردوە ﴾[6].

---

١ السجدة ٧

٢ فصلت: ٥٣

٣ محمد: ٢٤

٤ يونس: ١٠١

٥ الغاشية: ١٧

٦ عبس: ٢٤-٢٦

# بەندی پێنجەم

## ڕاڕەوەکان لەبارەی قەزاوقەدەر

موسڵمانان لەبارەی قەدەرەوە بەسەر چەند جۆرە بۆچونێك دابەش بون، لەو جێباسانەی دادێ باسیان دەکەین.

## جێباسی یەکەم

## ڕاڕەوی ئەوانەی بڕوایان بەقەدەر نیە

هەندێ گومڕا وایان لێهاتبو بڕوا بەقەدەر نەهێنن و نەیسەلمێنن. گوتویانە خودا بەر لەوەی شتان بەدیبهێنێ زانستی لەبارەیانەوە نیە، گوتویانە: خودا ئەوکاتەی پەیدابوەکان بەدیدێنێ، ئەوجا زانیاری لەبارەیانەوە دەبێ و دەزانێ چ دەکەن و چۆن دەبن.. پاکی بۆخوا.

ئەو گومڕایانە درۆیان بەخوا هەڵبەستاوە و پێیان وابوە کە کاتێك خودا فەرمان و بەرهەڵستی لەبەندەکانی دەکات، نازانێ کامیان گوێڕایەڵ دەبێ و کامیشیان سەرپێچی دەکات، نازانێ کامیان دەچێتە بەهەشت و کامیان دەچێتە دۆزەخ، تەنها ئەوکاتە دەزانێ کێ بەختەوەرەو کێ بەدبەختە کە ملکەچی شەریعەت دەبن یان نابن. ئەم گومڕایانە بڕوایان بەوە نیە خودا زانستی پێشینەی هەبێ، بڕوایان بەوەش نیە کە خودا قەدەری بونەوەری بەر لەبەدیهێنانی ئەرزو ئاسمانان نوسیبێ، کە لەقورئان و سوننەتدا سەلمێنراون.

ئەم ڕاڕەوە لەئاخروئۆخری سەردەمی یاوەراندا پەیدا بو، یەکەمین کەس مەعبەدلجوهەنی بانگەشەی بۆ کرد، پاشان سەرانی مۆعتەزیلەکان لاسایان

**کردەوەو بۆچونەکەیان کاویژ کردەوە، وەکو واصلی کوڕی عەتائی غەزال و عەمری کوڕی عەبید، کە زۆر قسەی ناقۆلایان لێ دەگێڕنەوە، بۆنمونە گوتویانە: خودا بەر لەئەفراندنی شتان زانستی پێیان نەبوەو قەدەری نەنوسیون**[1].

**پێغەمبەر ﷺ پەروای هەبوە کە نەتەوەکەی توشی پەتای ئەو گومڕاییە بن کە ئەم چینە توشی بون.**

**ئیبنو ئەبومیحجەن دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((اخاف على امتي من بعدي ثلاثا؛ حيف الأئمة، وايمانا بالنجوم، وتكذيبا بالقدر: **لەدوای خۆمدا پەروای سێ شتم لەنەتەوەکەم هەیە توشی بن؛ ستەم و زۆرداری فەرمانڕەوایان، بڕوابون بە ئەستێران، بڕوانەبون بەقەدەری خودا**))[2].

**ئەنەسی کوڕی مالیك** (ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی:** ((اخاف على امتي من خصلتين؛ تكذيبا بالقدر، وتصديقا بالنجوم: **لەدوای خۆم پەروای دو شتم لەنەتەوەکەم هەیە؛ بڕوانەکردن بەقەدەری خواو بڕواکردن بەئەستێران**))[3].

**پێغەمبەر ﷺ نەتەوەکەی وریا کردۆتەوە توشی ئەو گومڕاییە نەبن، ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((أُخِّر الكلام في القدر لشرار امتي: **قسەکردن و مشتومڕ کردن لەبارەی قەدەری خواوە بۆ خراپترینی نەتەوەکەم هەڵگیراوە**))[4].

**ئەبوئومامە** (ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((ان امر هذه الأمة لايزال مقاربا حتى يتكلموا في الولدان وفي القدر))[5].(1)

---

١ بگەڕێوە بۆ عقيدة السفاريني: (١/٣٠٠)، مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٥٩/٨)

٢ صحيح جامع الصغير: (١٢٠،١) (٢١٢)

٣ رواه ابو يعلى في مسنده والخطيب في التأريخ وابن عدي في الكامل بأسناد صحيح، صحيح جامع الصغير: (١٢٠/١)(١٢٠)

٤ رواه الطبراني في معجمه الاوسط والحاكم في مستدركه. صحيح الجامع الصغير: (١٧٣/١)(٢٢٤)

٥ رواه الطبراني في معجمه الكبير. صحيح الجامع الصغير: (٧٢/٣)(٣٠٦٠).

**پێغەمبەر ﷺ ناوی لەم جۆرەکەسانە ناوە ئاگرپەرستی ئەم نەتەوە، چونکە ئاگرپەرستەکان دەڵێن دو ئافەریدگار هەیە؛ روناکیو تاریکی. ئەم چینەش دەڵێن؛ دو ئافەریدگار هەیە، بەڵکو پێیان وایە هەر یەك لەم دوانە ئافەریدگارێکی جگە لەخودایە.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە دورەپەرێزی لەم چینە بکرێو سەردان و هاموشۆیان نەکرێ.**

**ئیبنو عومەر** (رەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:** ((لکل امة مجوس، ومجوس امتي الذين يقولون لا قدر، إن مرضوا فلا تعودوهم وإن ماتوا فلا تشهدوهم: **هەمو نەتەوەیەك ئاگرپەرستی هەبوە، ئاگرپەرستی نەتەوەکەی من ئەوانەن کەدەڵێن قەدەر نیە، جا ئەگەر نەخۆش کەوتن سەردانیان مەکەن، ئەگەر مردن بەشداری شاردنەوەیان مەکەن**))[2].

**هەر ئیبنوعومەر** (رەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:** ((القدرية مجوس هذه الأمة، ان مرضوا فلا تعودوهم وان ماتوا فلا تشهدوهم: **قەدەریەکان ئاگرپەرستی ئەم نەتەوەیەن، جا ئەگەر نەخۆش کەوتن سەردانیان مەکەن، ئەگەر مردن بەشداری شاردنەوەیان مەکەن**))[3].

**ئەو یاوەرانەی لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئەو ئاژاوەیەدا مابون لەهەمو لایەکەوە وەڵامی ئەو گومڕاییو قسە نابەجێیانەیان دەدایەوەو خەڵکیان لێ**

---

١ واتە: کاروباری ئەم ئوممەتە لە ڕێڕەوی پێشینە چاکەکان نێزیکە، هەتا ئەو کاتەی دەربارەی منداڵان و دەربارەی قەدەر قسان دەکەن، واتە ڕەفتاری بەندان دەدەنە پاڵ قەدەر، بەڵام سەبارەت بە منداڵان لەوانەیە مەبەستی منداڵانی هاوبەشپەرستان بێت کە ئایا لەگەڵ باوانیاندان لە دوزەخ یان لە بەهەشتدان، لەوانەیە مەبەستی تۆژینەوەی چۆنیەتی حاڵ و باری منداڵانی بەهەشت بێت، وە لەوانەیە درکە(كناية) بێت بۆ نێربازی و، لەمەدا هیچ نابینم.. (فيض القدير في شرح الجامع الصغير، ص٤٣١ مجلد(٢) رقم الحديث(٢٢٢٢)، ١٣٩١هـ، الطبعة الثانية، دار الفكر). -وەرگێڕ-

٢ رواه احمد في مسنده بأسناد حسن. صحيح جامع الصغير: (٣٧/٥) (٥٠٣٩)

٣ رواه احمد وابوداود. مشكاة المصابيح: (٣٨/١) رقم الحديث(١٠٧) والذي حققه الشيخ ناصر على المشكاة أن الحديث حسن الإسناد.

**بێدار دەکردنەوە نەچنە لایان و لەکۆڕیان دانەنیشن، فەرمودەو ئایەتەکانیان لەبارەی قەدەرەوە بۆ خەڵك دەهێنایەوەو باگۆی ئەوانیان پێ دەدایەوە.**

**نافع دەڵێ: پیاوێك هاتە لای ئیبنوعومەر گوتی: فلان كەس سلاوت لێ دەكات، ئەویش پێی گوت: وا پێم گەیشتوە بیدعەی پەیداكردوە، ئەگەر وای کردوە سلاوی منی پێ مەگەیەنە، چونكە خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوە دەیفەرمو:** ((يكون في هذه الأمة أو في امتي خسف أو مسخ أو قذف في أهل القدر: **قەدەریەكانی ئەم ئوممەتە یان توشی رۆچونی زەوی یان شێوە گۆڕین یان توشی نەنگ و لەكە دەبن))**[1].

**هەم دیسان ئیبنوعومەر بەمەرفوعی دەگێڕێتەوەو دەڵێ:** ((يكون في أمتي خسف ومسخ وذلك في المكذبين في القدر: **ئەوانەی لەنەتەوەی من بڕوایان بەقەدەر نامێنێ توشی رۆچونی زەویو رمونزنی دەبن))**[2].

**عەبدولواحیدی كوڕی سەلیم دەڵێ: چومە مەككە عەتائی كوڕی رەباحم دیت، پێم گوت: ئەبو موحەممەد! خەڵكی بەسرا دەڵێن: قەدەر نیە. گوتی: كوڕی خۆم! قورئان دەخوێنیەوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: سورەتی الزخرف بخوێنە. منیش خوێندمەوە:** ﴿حم، وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ، إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ، وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾[3].. **گوتی: دەزانی ئوممولكیتاب چیە؟ گوتم: خواو پێغەمبەر زاناترن. گوتی پەرتوكێكە خودا بەر لەبەدیهێنانی ئەرزو ئاسمانەكان نوسیویەتی، تێیدا نوسراوە فیرعەون**

---

١ رواه الترمذي وقال: هذا حديث حسن صحيح غريب.

٢ سنن الترمذي: ٤/٤٥٦) حديث رقم(٢١٥٢،٢١٥٣).

٣ الزخرف ١-٤ واتە: (حا میم، سوێند بە كتێبی رون و ئاشكرا (كە قورئانە)، ئێمە ئەو كتێبەمان كردوە بە قورئانێك، بەزمانی عەرەبی، بەڵكو ژیری و بیرو هۆشیتان بخەنە كار (تا لێی تێبگەن)، ئەم قورئانە لە (لوح محفوظ)دا كە سەرچاوەی قورئان و هەمو كتێبەكانی تری خوای تێدایە، زۆر بەرز و رێزدارمان كردوەو پڕمان كردوە لە دانایی.)

**دۆزەخیە، ئەو ئایەتەشی تێدایە** ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾[1].

**عەتا گوتی: وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامتی یاوەری پێغەمبەرﷺم دیت لێم پرسی: لەسەرەمەرگدا ئامۆژگاری بابت چ بو؟**

**گوتی: بابم بانگی کردم و گوتی: کوڕی خۆم تەقوای خوا بکەو لەخوا بترسە، بزانە ئەو کاتە لەخوا دەترسی کە بڕوات بەخوا هەبێ، بڕوات بەقەدەری خێرو شەڕ هەبێ، ئەگەر لەسەر غەیری ئەم بڕوایە بمری دەچیە دۆزەخ. گوێم لەپێغەمبەر ﷺ بو دەیفەرمو:** ((إن أول ما خلق الله القلم، قال: أكتب فقال: ما أكتب؟ قال: أكتب ماكان وماهو كـــائن الى الأبـــد: **یەکەمین شت کە خوا دروستی کرد پێنوس بو، پێی فەرمو: بنوسە، گوتی: چ بنوسم؟ فەرموی: ئەو قەدەرە بنوسە کە بوە، ئەوانەش بنوسە کە دەبن تا هەتایە))**[2].

**پێشەواو ئیمامەکان فتوایان لەبارەی ئەم چینە داوە کە هەر کەسێکیان بڕوای بەزانستی خوا نەبێ بێباوەڕو کافرە.. ئیمام مالیك و شافیعیو ئەحمەدیش لەو زانایانەن کە بەکافریان داناون**[3].

**ئەو چینەی کە بڕوایان بەزانینی پێشینەی خوا نەبو نەمان و لەناوچون.. سەفارینی دەڵێ: (زانایان دەڵێن؛ ئەو بێباوەڕانە نەمان و بنەبڕ بون، ئیمام مالیك و ئیمام شافیعیو ئیمام ئەحمەدو ئیمامی تریش بەبێباوەڕیان داناون)**[4].

**قورتوبی دەڵێ: ئەو ڕاڕەوە(مذهب) بڕایەوەو لەناوچو، نەمانزانیوە یەکێك لەنەوەکانی پاشینەدا هەبێ بانگەشە بۆ ئەو ڕاڕەوە بکات. ئیبنوحەجەری عەسقەلانی دەڵێ: قەدەرییەکانی ئەمڕۆ بڕوایان بەوە هەیە کە بەرلەوەی بەندەکان کردەوە ئەنجام بدەن خودا دەزانێ چ دەکەن و چ ناکەن. بەڵام لەوەدا**

---

١ المسند ١. واتە: (ئەبولەهەب هەردودەستی شەلەل بێ و عەمری نەمێنێ)

٢ رواه الترمذي وقال: هذا حديث غريب من هذا الوجه. سنن الترمذي: (٤/٤٥٧)(٢١٥٥). تەماشای سنن الترمذي للشيخ الناصرالدين الالباني (٢/٢٢٨) بکە.

٣ بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوي شيخ الاسلام (٨/٢٨٨)

٤ عقيدة السفاريني: (١/٣٠١).

لەگەڵ زانایانی پێشین ناکۆك و پێچەوانەن کە دەڵێن؛ پێمان وانیە کردەوەی بەندەکان لەلایەن خواوە تەقدیر کرابێ، بەڵکو بە سەربەخۆیی لەخۆمانەوە ئەنجام دەدرێ.. ئەم بۆچونە لەگەڵ ئەوەی کە پوکەڵ و لەهەق بەدەرە، بەڵام لەبۆچونەکەی پێشانیان ئەهوەنترە. دەڵێ: پاشینان نکوڵیان لەوە کردوە کە ویستی خودا پەیوەندی بەکردەوەی بەندەکانەوە هەبێ، نەبادا بڵێن دێرین بە نوێ پەیوەستە)[1].

نەوەوی دەڵێ: (قسەکەرانی کەلامناسان دەڵێن: قەدەریەکان نەمان و برانەوە، ئەوانەی قسەی ناقۆڵاو پوچەڵیان لەبارەی قەدەرەوە دەکرد. هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە نەماوە لەسەر ئەم راڕەوە مابێتەوە. لەئاخروئۆخرەکاندا قەدەریەکان بیروباوەڕیان بەقەدەر هەبو و دەیانسەلماند، بەڵام دەیانگوت؛ خێر لەلای خواوەیە، شەڕیش لەلای غەیری خواوەیە، ئەمە بەپێی قسەی ئەوان)[2].

(قەدەریەکان ئیعتراف بەوە دەکەن کە خودا مرۆڤی بە خاوەن ویست بەدیهێناوە، بەڵام دەڵێن؛ خاوەن ویستێکی زاڵە، واتە بەکەیفی خۆیەتی، ئەوی بوێ یان ئەمی بوێ. بەڵام کە دەیەوێ ئەم شتە دیاریکراوە بکات یان ئەو شتی دیاریکراو بکات ئەوا پێیان وانیە خودا بەدیهێنابێ)[3].

((ئەوانە لەهەقیقەتدا ئاگرپەرستی دوپەرستن، بەڵکو لەوانیش خراپترن، چونکە دوپەرستەکان بۆ هەمو گەردون دو بەدیهێنەریان دانابو، بەڵام ئەوانە بۆ هەمو کەسێك و بۆ هەمو کردەوەیەك دو بەدیهێنەریان بڕیارداوە، بەڵکو هەمو بەدیهێنراوێکیان کردۆتە بەدیهێنەر، ئەگەر لەبەر نەسازی(تناقض)ەکەیان نەبوایە لەئاگرپەرستان کافرتر بون.

دەرەنجامی قسەکەیان ئەوەیە کە کردەوەی بەندەکان لەبەدیهێنان و موڵکی

---

١ عقيدة السفاريني (٣٠١/١)

٢ شرح النووي على مسلم: (١٥٤/١٥).

٣ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٢٠٦/٨).

خوا وەدەرنێن و پێیان وایە لەژێر رکێفی پەروەردگارێتی خوادا نین، شتی وا لەموڵکی خوا رودەدات کە نایەوێت، شتی وای دەوێت کە نابێت، بۆیە لەخوا بێنیاز و بێپێویستن و داوای یارمەتی لەخوا ناکەن بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و وازلێهێنانی گوناحان و لەگوناح و خراپەکانیان پەنا بەخوا ناگرن و داوا لەخوا ناکەن بۆ راستەڕێ رێنوێنیان بکات))[1].

قەدەریەکان وایاندەزانی پاك و پیرۆزی خوا رادەگرن کە ئەگەر پێیان وابێ خودا بڕوای لەبێباوەڕان ویستوە بەڵام بێبڕواکە خۆی بێبڕوایی ویستوە، بیانوشیان ئەوەبو دەیانگوت ئەگەر وانەبێ ئەوا دەبێتە مایەی ستەم و زۆرداریی، چونکە ئەگەر خودا بێبڕوایی لەبێباوەڕان خواستبێ، ئیدی چۆن سزایان دەدات.

بەڵام ئەوانە وەکو راڤەکاری طەحاویە دەڵێ: وەکو ئەو کابرایەیان لێهاتوە کە لە چرقەی گەرماوە بۆ ناو ئاگر هەڵدێ، ئەوان لەشتێك هەڵاتون بەڵام کەوتونە ناو شتێکی خراپتر، بەپێی قسەی ئەوان بێ دەبێ ویستی بێبڕوایان بەسەر ویستی خوادا زاڵ بوبێ، کەواتە ویستی بێبروەکان هاتەدیو ویستی خودا نەهاتەدی، هەڵبەت ئەوەش دزێوترین بیروباوەڕە، ئەو قسەیەی ئەوان دەیڵێن بەڵگەیان نیە، بەڵکو لەگەڵ بەڵگەکاندا پێچەوانەن)[2].

ویستی خودا لەسەر بێبڕوابونی بێباوەڕان؛ هیچ ستەم و زوڵمێکی تێدا نیە، وەك قەدەریە ستەمکارەکان پێیان وایە زوڵمە! چونکە پەروەردگار بەڵگەی تەواو و یەکلاکەرەوەی لەسەر بەندەکان هەیە، وێڕای ئەو هەمو حیکمەتەی تەنیا خۆی دەیزانێ.

ئەبوئەسوەدی دیئەلی دەڵێ: عیمرانی کوڕی حوصەین پێی گوتم: (چۆنی لێ تێ دەگەی؟ ئەم خەڵکە کردەوان ئەنجام دەدەن و کۆشش دەکەن، ئایا لەقەدەری

---

١ معارج القبول: (٢/٢٥٣)

٢ شرح الطحاوية ل٢٧٧

خوا بڕاوەتەوەو بڕیاری قەدەری لەسەرە؟ یان هەر ئەوەیە فەرمانی پێغەمبەران جێبەجێ دەکەن و قەدەر بڕیاری لەسەر نەداوە؟

گوتم: بەڵکو شتێکە لەقەدەر بڕاوەتەوەو تێپەڕیوە.

گوتی: زۆرداریو ستەم نیە؟

گوتی: جا زۆر ترسام، گوتم: هەمو شتێك بەدیهێنراوی خوایەو موڵکی ژێر رکێفی خۆیەتی، هەرچ بکات بەرپرسیار نیە، بەڵکو غەیری وی بەرپرسیارن.

پێی گوتم: خوا میهرەوەرت بکات، تەنها مەبەسم ئەوەبو تاقیت بکەمەوە.

کاتی خۆی دو پیاوی هۆزی موزەینە هاتنە لای پێغەمبەرﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کردەوەو کۆششەی خەڵك ئەنجامی دەدەن ئایا لەقەدەری خوا بڕاوەتەوەو بڕیاری قەدەری لەسەرە؟ یان هەر ئەوەیە فەرمانی پێغەمبەران جێبەجێ دەکەن و قەدەر بڕیاری لەسەر نەداوە؟

فەرموی: (نەخێر، بەڵکو لەقەدەر بڕاوەتەوەو بڕیاری لەسەر دراوە، بەراستخەرەوەی ئەم گوتەیەش لەقورئاندایە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا: سوێند بەنەفس و رێکخەرەکەی، کە خراپ و باشی پێ ناساندوە﴾[1].

ئیبنودەیلەمی دەڵێ: چومە لای ئوبەی کوڕی کەعب و پێم گوت: لەبارەی قەدەرەوە شتێکم کەوتۆتە دڵ، هەندێ قسەم بۆ بکە، بەڵکو خودا ئەو شتەم لە دڵدا نەهێڵێ، گوتی: ئەگەر خودا سەرجەم ئەهلی ئەرزو ئاسمانەکان سزا بدات نابێتە ستەمکار و ئەگەر رەحمیان پێبکات رەحمەتەکەی باشترە لەکردەوەکانیان. ئەگەر بەئەندازەی چیای ئوحود لەپێناوی خوا زێڕ ببەخشی، خودا لێت قبوڵ ناکا تا بڕوا بەقەدەر دێنیو بڕوات بەوە دەبێ ئەوەی خودا بۆتی نوسیوە هەر دێتە دی و ئەوەی بۆتی نەنوسیوە قەت توشت نابێ و ئەگەر لەسەر غەیری ئەو باوەڕە بمری دەچیە ناو ئاگری دۆزەخ.

---

١ الشمس: ٧،٨

دەڵێ: پاشان چومە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، ئەویش وای گوت، چومە لای حوزەیفەی کوڕی یەمان، ئەویش وای گوت، پاشان چومە لای زەیدی کوڕی سابیت ئەویش وای گوت[1].

قەدەریەکان بەهۆی ئەم بۆچونە لاڕێیەوە گومڕاکانیشیان بەخۆیان خۆش کردبو. عومەری کوڕی هەیسەم دەڵێ: سەفەرێکمان بەکەشتی کرد، قەدەری و ئاگرپەرستێکمان لەگەڵدا بو، قەدەریەکە بەئاگرپەرستەکەی گوت: ببە موسڵمان.

ئاگر پەرستەکە گوتی: تا خوا دەیەوێ.

قەدەریەکە گوتی: خودا دەیەوێ. بەڵام شەیتان نایەوێ.

ئاگرپەرستەکە گوتی: خودا شتێکی ویستوەو شەیتانیش شتێك، ویستی شەیتان زاڵ بو، دیارە شەیتان بەهێزە!

لەگێڕانەوەیەکی تردا گوتی: کەواتە من لەگەڵ بەهێزترەکەم[2].

## گفتوگۆی یارانی ڕێباز ( أهل السنة ) لەگەڵ قەدەریەکاندا

بۆچونی موعتەزیلەکان نەیتوانیوە خۆی لەمەیدانی مشتومڕی موسڵمانە ڕەمەکیەکانی سوننەتیەکانیش ڕاگرێ چجای زاناو بلیمەتان.

زانایان دەگێڕنەوە کە جارێکیان عارەبێکی خێڵەکی دەچێتە لای عەمری کوڕی عوبەیدو پێی دەڵێ: وشترەکەم دزراوە، لەخوا بپاڕێوە بۆم بگەڕێنێتەوە.

عەمری کوڕی عوبەید نزا دەکات و دەڵێ: خوایە وشتری ئەو هەژارە دزراوە، تۆش نەتویستوە بدزرێ، خوایە بۆی بگەڕێنەوە.

خێڵەکیەکە گوتی: تازە نایەتەوەو بێهومێد بوم.

گوتی: بۆچی؟

---

١ صحيح مسلم: (٤/٢٠٤١) ورقم الحديث(٢٦٥٠).

٢ سنن ابي داود: (٤/٣١٠) ورقم الحديث(٣٦٩٩)

گوتی: چونکە ئەگەر خوا نەیویستبێ بدزرێو بشدزرێ، پێم وانیە ئەگەر بیەوێ بگەڕێتەوە بۆم بگەڕێتەوە.

ئیتر هەڵساو ئەوێی بەجێ هێشت[1].

**وەڵامدانەی کابرایەکی قەدەری لەلایەن ئەبوعوصامی قەستەڵانی:**

پیاوێك بە ئەبوعوصامی گوت: ئەگەر خودا ڕێنوێنیم نەکات و بمخاتە گومڕاییەوە و پاشان سزام بدات، ئایا ستەمی لێ نەکردوم؟

ئەبو عوصام گوتی: ئەگەر ڕێنوێنی شتێك بێ ئەوا هی خودایە، بەویستی خۆیەتی بیداتە کێو نەیداتە کێ.[2]

**گفتوگۆی نێوان عەبدولجەباری هەمەدانیو ئەبو ئیسحاقی ئەسفەراینی:**

جارێکیان عەبدولجەباری هەمەدانی کەشێخێکی موعتەزیلەکان بوە- دەچێتە لای صاحبی کوڕی عباد، (ئەبو ئیسحاقی ئەسفەراینی)یش لەوێ دەبێ کە پێشەوایەکی ئەهلی سوننەت بو. کە عەبدولجەباری قازی لەوێ ئەبو ئیسحاقی مامۆستا دەبینێ، دەڵێ: پاکی بۆ ئەو خوایەی لەکاری ناپەسەند پاك و بێخەوشە.

یەکسەر مامۆستا گوتی: پاکی بۆ ئەو خودایەی هیچ شتێك لەناو موڵکەکەیدا رو نادات ئەگەر ویستی ئەوی لەگەڵدا نەبێ.

قازی گوتی: باشە خوا دەیەوێ سەرپێچی لێبکرێ؟

مامۆستا گوتی: ئەدی سەرپێچی بەسەر ویستی خوا زاڵ دەبێ؟

قازی گوتی: باشە ئەگەر خودا ڕێنوێنیم نەکات و بڕیاری خراپکاری لەسەر دابم، ئایا چاکەی لەگەڵدا کردوم یان خراپە؟

مامۆستا گوتی: ئەگەر شتێکت پێنەدات و هی خۆت بێ خراپەی لەگەڵدا

---

١ شرح اصول اعتقاد أهل السنة: ل(٧٤٠)

٢ شرح الطحاوية: ل٢٧٨.

کردوی، بەڵام ئەگەر شتێك هی خۆی بێو نەتداتێ ئەوا بەمیهرەبانی خۆیەوە تایبەتە.. بەویستی خۆیەتی بیداتە کێ.

بەم جۆرە قازی بە سەرسامیەوە دەمکوت بو.

لەمێژوەکەی طەبەریشدا هاتوە کە غەیلان بەئامادەیی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا کەبۆ گفتوگۆیەك بانگی کردبو– بەمەیمونی کوڕی مەهرانی گوت: ئایا خوا دەیەوێ سەرپێچی لێ بکرێ؟

مەیمەن پێی گوت: ئەدی سەرپێچی بەسەر ویستی خوا زاڵ دەبێ؟[1].

**لەنێوان عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو غەیلانی دیمەشقیدا:**

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ غەیلانی دەمڕاستی موعتەزیلان دەکەوێتە گفتوگۆو پێی دەڵێ: غەیلان! پێم گەیشتوە لەبارەی قەدەرەوە مشتومڕان دەکەی؟

گوتی: فەرماندەی بڕواداران، بڕوا بکە درۆ بەزمانی منەوە دەکەن.

عومەر گوتی: سورەتی (یس)م بۆ بخوێنەوە.

ئەویش دەستی بەخوێندنەوە کرد: ﴿ یس، وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ، إِنَّكَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ، عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ، تَنزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ, لِتُنذِرَ قَوْمًا مَا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ، لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَى أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ، إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلاَلاً فَهِيَ إِلَى الأَذْقَانِ فَهُمْ مُقْمَحُونَ، وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ: یاسین، سوێند بەقورئان کە سەرلەبەر کارزانیە، تۆ یەك لە پێغەمبەرانی، کەوتویە سەر راستەرێگە، ئەم قورئانە هەرەخاوەن دەسەڵاتی دلۆڤان ناردویەتە خوار، تا بەهۆی ئەو ترس وەبەر گەلێك بێنی کە باوانی پێشویان کەس لەخوای نەترساندون و بێئاگا بون،

---

1 بۆ ئەم دو سەربردەیە تەماشای موحەقیقی شرح الطحاوية ل٢٧٨ بکە، هەروەها سەرنج بدە فتح الباري: (٤٥١/١٣)

بەڵێنی خوا زۆرینەیان دەگرێتەوە؛ سا ئەوان بڕوا ناهێنن، ئێمە ملیان دەخەینە ناو زنجیرەوەو تا چەنە شەتەکیان دەکەین، کە ناتوانن بۆ هیچ لایەك سەر ببزێون، چاویشیان شۆڕە، لەمپەرێکمان لە پێشیانەوە داناوەو لەمپەرێك لە پشتیانەوە، تارمایشمان هاویشتە سەر گلێنەیان کە نابینن ﴾[1].

غەیلانی گوتی: فەرماندەی بڕواداران؛ بەو خوایە دەڵێی یەکەم جارە دەیخوێنمەوە. ئەتۆ شایەد بە پەشیمانم لەو قسانەی لەبارەی قەدەرەوە کردومە.

عومەر گوتی: خوایە ئەگەر راست دەکا تەوبەکەی گیرا بکە، ئەگەر درۆش دەکات بیکە بە پەندی بڕواداران[2].

موعازی کوڕی موعاز دەڵێ: هاوڕێیەکم پێی گوتم: (تەیمی بە لای ماڵی ئیبنوعەون تێپەڕی، لایدا لایو روداوەکەی بۆ گێڕایەوە، ئیبنوعەون گوتی: من لەدیمەشقێ دیتم هەڵواسرا بو)[3].

ئەبوجەعفەری خەتەمی دەڵێ: (خۆم دیتم عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بانگی غەیلانی کردبو، چونکە بۆی گەڕابۆوە لەبارەی قەدەرەوە قسەی نابەجێ دەکات، پێی گوت؛ غەیلان ئەوە چیە پێم دەگاتەوە؟ هەی داڕزێی، ها ؟

گوتی: ئەی فەرمانەدەی بڕواداران! بڕوا بکە درۆم بەدەمی دەکەن.

عومەر گوتی: چ دەڵێی لەبارەی زانینی خوا؟

گوتی: زانیوێتی.

عومەر گوتی: تازە قسەت نەما، بڕۆ چ دەڵێی بڵێ.

---

١ یس: ١-٩

٢ لیکۆلەرەوەی پەرتوکی شرح اصول اعتقاد اهل السنه دەڵێ: ئاجوری لە (الشریعه)دا ئەم روداوەی گێڕاوەتەوە لەلاپەڕە (٢٢٩) هەروەها (ابن بطة)ش لە الابانة(٢/٣٢٦-٣٢٧)دا گێڕاویەتەوە.

٣ لیکۆلەرەوەی شرح اصول الاعتقاد دەڵێ: رواه عبدالله بن احمد -بدون واسطة بین معاذ وابن عـــون- في السنة ص١٢٨ وابن بطة -وفیه ان القائل: انا رأیته. هو ابن عوف. الابانة (٢/٣٢٧) قال الهیثمي: رواه احمد ورجاله ثقات. مجموع الزوائد (٧/٢٠٧).

پاشان گوتی: غەیلان! ئەگەر وا بلێی تەواوە، بەلام ئەگەر ئینکاری زانینی خوا بکەی کافر دەبی، باشترە دانی پێدا بنێی نەك ئینکاری بکەی و پێی کافر بی. ئایا سورەتی (یس)ت لەبەرە؟

گوتی: بەڵێ.

پێیگوت: بخوێنەوە.

ئەویش دەستی کردە خوێندنەوەی: ﴿ يس، وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ، إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ، عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ، تَنْزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ، لِتُنْذِرَ قَوْمًا مَا أُنْذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ، لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَى أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ ﴾[1].

پێی گوت: راوەستە، چۆنی دەیبینی؟

گوتی: فەرماندەی بڕواداران! دەڵێی یەکەمجارە دەیخوێنمەوە.

پێی گوت: هێشتا بخوێنەوە.

ئەویش خوێندیەوە: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِي أَعْنَاقِهِمْ أَغْلاَلاً فَهِيَ إِلَى الأَذْقَانِ فَهُمْ مُقْمَحُونَ، وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا ﴾[2].

عومەر پێی گوت: بلێ ﴿ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ، وَسَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنْذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنْذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ ﴾[3].

پێی گوت: ئەدی ئێستا چۆن دەیبینی؟

گوتی: دەڵێی قەت ئەو ئایەتانەم نەخوێندۆتەوە، پەیمان بێ بۆ خوا جارێکیتر نەگەڕێمەوە سەر ئەو قسانەی کردومە.

گوتی: مادەم وایە، بڕۆ.

کە ڕۆیشت عومەر گوتی: خوایە ئەگەر درۆ دەکات وەبەر شمشێر بکەوێ.

دەڵێ: لەسەردەمی عومەر هیچیتر قسەی نەکرد، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك دەستی بەوجۆرە قسانە کردەوە، یەزید زۆر گرنگی بەو شتە

---

١ یس ١ ٢ یس ٨-٩ ٣ یس ٩-١٠

نەدەدا. بەلاّم کە هیشام بوە خەلیفە بانگی کردو پێی گوت: ئەدی لەلای عومەردا پەیمانت بەخوا نەدا ئەو قسانە نەکەی؟

گوتی: مۆڵەتم بدە، وەڵڵاهی چیدی واناکەم.

هیشام گوتی: خوا مۆڵەتم نەدا ئەگەر مۆڵەتت بدەم، فاتیحەت لەبەرە؟

گوتی: بەڵێ.

پێی گوت: بخوێنەوە.

ئەویش دەستی کردە خوێندنەوە: ﴿ الْحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ، إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾[1].

پێی گوت: راوەستە، لەسەر چ کۆمەکخوازی لەخوا دەخوازی؟ لەسەر کارێك لەدەست وی بێ و تۆ پێت نەکرێ؟ یان لەسەر کارێك لەدەست تۆ یان لەدەست ئەو بێ؟ بیبەن دەست و پێیەکانی ببڕن و لەملی دەن، ئەوجا هەڵیواسن[2] [3].

قەدەرییە نەرێویژەکان خۆیان لەکۆمەك خواستن لە خوای تاك و تەنیا بێبەش کردوە، چونکە پێیان وایە خودا توانای بەسەر کردەوەی بەندەکاندا ناشکێ و بەندە خۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی، کەواتە چۆن کۆمەکخوازی لەشتێکدا دەکەن کە خوا توانای بەسەردا نەبێ.

ئەو کەسانە بەتەنها متمانە دەکەنە سەر کۆشش و هێزو زانستی خۆیان، وەك چۆن کرێکارێك داوای کرێ لەخاوەنەکەی دەکات، ئەوانیش لەو سۆنگەیەوە داوای پاداشت لەخوا دەکەن. بەلاّم خوا پێویستی کردەوەی بەندەکانی نیە، بەڵکو بەندەکان خۆیان قازانج دەکەن و بەرژەوەندیەکە بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، بەندەکان خۆیان پێویستیان بەکردەوەی باش هەیە، ناشتوانن دەستبەرداری کۆمەکی خوا بن ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ: خوایە!

---

١ الفاتحة ٢-٥

٢ قال محقق كتاب شرح اصول اعتقاد اهل السنة: رواه عبدالله بن احمد -المذكور في المسند- في السنة. ص١٢٧-١٢٨.

٣ شرح اعتقاد اصول اهل السنة: ٧١٣-٧١٥.

تەنها تۆ دەپەرستین و کۆمەککخوازی هەر لەتۆ دەکەین ﴾[1]، ﴿ فاعْبُدْه وتوَكـــل عَلَيْهِ: تەنها خوا بپەرستە و پشت بەو ببەستە ﴾[2].

## چەند گومانێك و وەڵام

**١- واتای رەشکردنەوەو چەسپاندن لـە پـەڕاو و کـەم و زیـاد کردنـی تەمـەن.**

هەندێ کەس لە ئاست چەند ئایەت و فەرمودەیەکدا توشی ئاڵۆزی(اشکال) دەبن و دەڵێن: ئەگەر خوا هەمو شتێکی زانیوەو سەرجەمی لەلای خۆیدا لەپەرتوکێك نوسیوە، ئەدی واتای ئەم ئایەتە چیە؟ ﴿ يَمْحُوا اللَّـــهُ مَـــا يَشَـــاءُ ويُثْبِتُ: خودا هەرچی بوێ بەویستی خۆی رەشی دەکاتەوە یان دەیچەسپێنێ و دەیهێڵێتەوە﴾[3]. ئەگەر بژێوی و کردەوەو ئەجەل نوسرا بن و زیادو کەم نەبن، ئەدی بۆ لێکدانەوەی ئەم فەرمودەیە چ دەڵێن: ((من سرّه ان يبسط له في رزقه وينسأ له في أثره فليصل رحمَهُ: کێ حەز دەکات بژێوی گوشاد بێ و تەمەنی درێژ بێ با سەردانی خزمان بکات)). هەروەها چۆن ئەم گوتەیەی (نوح) لێك دەدەنەوە کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ، يَغْفِرْ لَكُـــمْ مِـــنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى: نوح بە هۆزەکەی گوت: خوا بپەرستن و لێی بترسن و بەگوێم بکەن تا بەڵکو لە گوناحتان ببەخشێ و بتانهێڵێ تا ماوەیێ دیاریکراو﴾[4].

بەهەمان شێوە لەئاست ئەو فەرمودەیە چ دەڵێن کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خودا تەمەنی پێغەمبەر داودی کردە سەد ساڵ دوای ئەوەی چل ساڵ بو.

لەوەڵامی ئەو پرسیارانەدا دەڵێین: بژێوی و تەمەن دو چەشنن:

چەشنێکیان قەدەر براندۆتیەوەو لە تەختی پارێزراو(لوح المحفوظ)دا نوسراوە، ئەم جۆرەیان گۆڕان و جێگۆڕکێی بۆ نیە. چەشنەکەی تر ئەوانەن کە

---

١ الفاتحة ٥
٢ هود ٩٣
٣ الرعد ١٢٣
٤ نوح ٣

خودا بەفریشتەکانی گوتوەو ئەوانی پێ ئاگادار کردوە، ئەم جۆرەیان زیادو کەم دەکات ، بۆیە خوا فەرمویەتی: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ﴾[1] ئوممولکیتاب ئەو تەختە پارێزراوەیە کە خودا هەمو شتێکی تێدا نوسیوە، تەمەن و بژێوی لەپەرتوکی لای فریشتاندا بەپێی هۆو هۆکاران کەم و زیاد دەکرێ، فریشتەکان بژێویو تەمەنێکی دیاریکراوی بۆ دەنوسن، جا ئەگەر پەیوەندی خزماتی بەجێ گەیاند ئەوا بژێویو تەمەنی زیاد دەبێ، ئەگەرنا لێیان کەم دەکرێتەوە[2].

(ئەجەلیش دو جۆری هەیە، یەکێکیان ڕەهایە(مطلق)و تەنها خوا دەیزانێ، ئەوی تریش پابەندە(مقید)، خودا فەرمان بەفریشتە دەکات ئەجەلێکی دیاریکراو بۆ بەندەی بنوسێ، جا ئەگەر پەیوەندی خزمایەتی بەجێ گەیاند ئەوا فەرمانی پێ دەکات تەمەن و بژێوی زۆر دەکات. فریشتەکەش نازانێ تەمەن و بژێویەکەی زیاد دەبێ یان کەم، بەلاّم خودا دەزانێ کۆتاییەکەی چەندە. ئەوجا کە ئەجەل دادەبەزێ پێش و پاش ناکەوێ[3].

ئیبنوحەجەری عەسقەلانی دەڵێ: (ئەوەی لەزانینی پێشینەی خوادا هەیە گۆڕان و جێگۆڕکێی بەسەردا نایێت، بەلاّم ئەو کردەوانەی ڕەنگە گۆڕانی بەسەردا بێت دور نیە بەزانینی فریشتە پارێزکارو تەرخانکراوەکان پەیوەست بێو لەوێدا ڕەشکردنەوەو چەسپاندن ڕو بدات، وەکو کەم و زیادبونی تەمەن. بەلاّم ئەوەی لەزانینی خوادا هەیە ڕەشبونەوەو چەسپاندن و هێشتنەوەی تێدا نیەو زانستەکەش لەلای خوا دایە.)[4]

## ٢- پێکەوە گونجانی بڕیاری قەدەرو لەدایکبونی خواناسانە:

ڕەنگە یەکێك بپرسێ چۆن دەگونجێ خوا هەمو شتێکی خەملاندبێو پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی هەمو کەسێك کە دەبێ بەخواناسی لەدایك دەبێ؟

---

١ الرعد ٣٩

٢ بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوي شيخ الإسلام: (٨/٥٤٠)

٣ بگەڕێوە هەمان سەرچاوە: (٨/٥١٧).

٤ فتح الباري: (١١/٤٨٨)

لەوەڵامدا دەڵێین: لەنێوان ئەم دوەدا هیچ نەسازیو تێك گیربونێك نیە، خودا بەندەكانی بەبیروباوەڕێكی ساغ و بێخەوش بەدیدێنێ و وایان لێدەكات بیروباوەڕی راست و دروست وەربگرن، بەڵام كە لەدایك دەبن شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكان گەمارۆی دەدەن و لەڕێی خواناسی لای دەدەن، ئەوانەی خوداش دەیەوێ لەسەر ڕێی ڕێنوێنی بمێننەوە، دەمێننەوە.

خوا دەزانێ كێ لەسەر فیترەتی خواناسی پاك و بێگەرد دەمێنێتەوەو كێش لەو فیترەتە لادەدات. خودا لە ئەزەلەوە ئەوەی زانیوەو نوسیویە، كەواتە هیچ نەسازیو ناكۆكیەك لەنێوان ئەم دوانەدا نیە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا دەفەرموێ: ((إني خلقت عبادي حنفاء فاجتالتهم الشياطين، وحرّمت عليهم ما أحللت لهم، وأمرهم أن يشركوا بي ما لم أنزل به سلطانا: من بەندەكانم بەخواناسی بەدیهێناوە، بەڵام شەیتانەكان مشتیان لێدەدەن و حەڵاڵیان بۆ حەرام دەكەن و فەرمانیان پێ دەكەن هاوبەشم بۆ پەیدا بكەن))[1].

خودا زانیویێتی كێ بەشەیتان فریو دەخوات و لەفیترەتی خواناسی لادەدات و كێش لەسەر راستەڕێی ڕێنوینی سەقام دەگرێ.

دوای ئەم رونكردنەوەیە بۆت دەردەكەوێ واتای ئەو فەرمودەیە چۆن لێك دەدەیەوە كە دەفەرموێ: ((خلق الله يحيى بن زكريا في بطن أمّه مؤمنا، وخلق فرعون في بطن أمه كافرا: خودا یەحیای لەناو زگی دایكیدا بەباوەڕداری بەدیهێناو فیرعەونیش لەناو زگی دایكیدا بەبێباوەڕی))[2].

١ رواه مسلم في صحيحه عن عياض بن حمار ﷺ

٢ رواه ابن عدي في الكامل والطبراني في الأوسط. صحيح الجامع الصغير: (١١٣/٣) ورقم الحديث(٣٢٣٢).

**٣- ئەگەر شتەكان خەملێنرابن و ئەندازەيان دياركرابێ‌و قەزاوقەدەر برابێتەوە، ئەدی واتای ئەم ئايەتە چيە:** ﴿ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ ﴾؟

**رەنگە هەندێ كەس بەڵگە بۆ گوتەی قەدەريە نەرێوێژەكان بهێننەوەو بڵێن خواش دەفەرموێ:** ﴿ مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنْ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ: **ئەوەی لەچاكە بەتۆ دەگا لەخواوەيەو ئەوەی لەبەديی و بێفەڕی بەتۆ دەگا لەخۆتەوەيە** ﴾.

**وا دەزانن مەبەست لە** (سَيِّئَةً) **و** (حَسَنَةً)**ی ئەم ئايەتە فەرمانبەری‌و سەرپێچيە.**

**لەراستيدا ئەوانە لە تێگەيشتنيدا بەهەڵەدا چون، چونكێ لێرەدا مەبەست لە** (الحسنات) **بەخشش و بەهرەكانی خوايە،** (السيئات)**يش تەنگانەو ناخۆشيەكانە. لەرەوتی ئايەتەكەوە واتاكەمان بۆ رون دەبێتەوە؛ دەفەرموێ:** ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِكُمْ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ وَإِنْ تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِكَ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَمَالِ هَؤُلاَءِ الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا، مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنْ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ: **لەهەركوێ بن، لەناو قەڵاو كەلوی تۆكمەو قايميش بن. مردنتان هەر دەگاتێ، دوڕوەكان ئەگەر خۆشيەكيان پێ ببڕێ دەڵێن لەلای خواوەيە، بەڵام ئەگەر توشی ناخۆشيەك ببن دەڵێن بەسەبارەتی تۆيە، پێيان بڵێ خۆشی‌و ناخۆشی هەردوكيان لەلای خواوە تەقدير كراون. ئەوانە چيانە لەگوتان ناگەن، هەر گوشادی‌و خۆشيەكت پێ ببڕێ لەچاكی خودايە، هەر ناخۆشييەكت توش ببێ لەخراپەی خۆتە** ﴾[١].

**خودا لێرەدا باسی دوڕوەكان دەكات و دەفەرموێ: ئەگەر چاكەيەكی وەكو**

---

١ النساء ٧٨-٧٩.

بژێوی‌و سەرکەوتن و ساغ و تەندروستیان پـێ بگـات دەڵێـن ئـەوە لـەلای خواوەیـە، بەڵام ئەگەر خراپیەکی وەکو شکست و نەخۆشی‌و ترسیان توش ببێ دەڵێن هـەموی لـەلای تۆوەیـە موحەممـەد! خـەڵك بـەهۆی ئـەو دینـەی تـۆ هێناوتـە دوژمنایـەتیمان دەکات و لەپێناوی ئەو دینەدا توشی ئەو تەنگانەو ناخۆشیانە بوین.

لێرەدا (چاکە) بەخشش دەگرێتەوە، (خراپە)ش تەنگانە و موسیبەت، وەکو لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا: دوڕوەکان کەیف خۆش و شاد دەبـن ئەگـەر ئێـوە ناخۆشـیەکتان تـوش ببـێ، دڵتـەنگ و گـرژ دەبـن ئەگـەر خۆشیەکتان پێ ببڕێ، بەڵام ئەگەر ئارام بگرن و پارێزکاری بکەن فێڵ و پلانیان کارتان تێ ناکات ﴾[1].

﴿ وَبَلَوْنَاهُمْ بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّـــهُمْ يَرْجِعُــونَ: بەخۆشی‌و ناخۆشی تاقیمان کردنەوە تا بەڵکو بگەڕێنەوە﴾[2].

پاشـان خـوا بڕیـاری لەسـەر ئـەوە داوە کـە تەنگانـەو خۆشـی و ناخۆشـی و بەخششەکان هەر هەموی بەپێی قەدەرو ویستی خوایە ﴿ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّــهِ فَمَالِ هَؤُلاَءِ الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾.[3]

پاشان خوا رونی کردۆتەوە ئەو خراپانەی کە بریتیـە لەتەنگانـەو ناخۆشـی بەهۆی گوناحەکانی خودی بەندەکانـەوە توشیان دەبێ، بـەڵام خێرو خۆشـی‌و بەخششەکان هۆکارەکانی نایەنە ژماردن، چونکە لەمیـهرەبانی خواوەیـە، جـا خێرو خۆشی هەیە بەهۆی کردەوەکانەوە دەبێ و هەشە بەهۆی بـەزەیی خـوا. واجبی بەندەکان ئەوەیە سوپاس و ستایشی خوا بکەن لەمەڕ بەخششەکاندا، پەشـیمانی دەربـڕن و داوای لێخـۆش بـون لـەخوا بکـەن تـا لـەو گونـاح و تاوانانەیان خۆش ببێ کە بونەتە هۆی تەنگانەو گرفتەکانیان.

ئەگەر لەم وتانەی خوا رابمێنی: ﴿ مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ...﴾ ﴿ مَا أَصَـــابَكَ

---

١ ال عمران ١٢٠ ٢ الاعراف ١٦٨ ٣ النساء: ٧٨

مِنْ سَيِّئَةٍ...﴾ بۆت دەردەكەوێ چاكەو خراپەكە كە خۆشیو ناخۆشیە كردەی خوایە بۆ بەندەكانی، بەڵام ﴿ فَمِـنْ نَفْسِـكَ ﴾ واتە بەهۆی گوناح و تاوانی بەندەكانەوەیە. جا هەرچەندە ئەم شتانە لەقەدەردا خەملێنراون بەڵام قەدەری خوا وایە كە تەنگانەو ناخۆشی بەهۆی گوناحەوە توشی ببێت.

بەڵام ئەو چاكەو خراپانەی كردەوەی بەندەكان دەیگرێتەوە لەبارەیەوە نەوتراوە ﴿ مَا أَصَابَكَ ﴾ بەڵكو خوا فەرمویەتی: ﴿ مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ خَـيْرٌ مِنْهَا وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُـونَ: هەر كەس كاری چاك بكا، باشتر لەو پاداشتی پێ دەدرێتەوەو هەر كەسانێك خراپە دەكەن بەقەد كردەوەی خۆیان سزا وەردەگرن ﴾[1].

لێرەدا فەرمویەتی ﴿جَـاءَ﴾ چونكە كردەی وەدەستهێنەكەیە، بۆیە بەراشكاوی لەبواری گوناح و تاواندا فەرمویەتی: ﴿ فَلاَ يُجْزَى الَّذِينَ عَمِلُـوا السَّيِّئَات إِلاَّ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾.[2][3]

## ٤- چۆن خودا شـەڕ دەخوڵقێنـێ و دەیخـەملێنێ؟

رەنگە هەندێ لەقەدەریەكان پەشێوی بنێنەوەو بڵێن خودا لە كردەوەی شەڕ پاك و پیرۆزە، لەسەر بەندەكانیش واجبە خودا لەشەڕ و كردەوەی شەڕ بەپاك راگرن. هەڵبەت ئەم جۆرە كەسانە هەق و ناهەقیان ئاوێتە كردوەو لەخۆیان شێواندوە.

وەڵامی ئەو گومانە بەو جۆرەیە؛ خودا هیچ شەڕێكی رەها ناخوڵقێنێ كە قازانج و بەرژەوەندیو حیكمەت و میهرەبانیو چاكەی تێدا نەبێ. بەبێ گوناح كەسیش سزا نادات: زانایانی ئیسلامی وەكو ئیبنو تەیمیە و ئینوقەییم و زانای تریش زۆر حیكمەت و میهرەبانی خوایان لە بەدیهێنانی ئیبلیس و مێرو

---

١ القصص ٨٤

٢ بۆ ئەم توێژینەوەیە بگەڕێوە بۆ سەر مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/١١٠،٢٢٤)

٣ القصص ٨٤.

و جڕوجانەوەرو مێشولان رون کردۆتەوە. شت هەیە بەڕویەك لێکی بدەیتەوە شەڕە، بەلاَم بەروێکیتر بۆی بچی خێرە، بۆنمونە؛ خودا کە ئیبلیسی بەدیهێناوە کە بەندەکانی خۆی پێ تاقیدەکاتەوە، بەندە هەیە دژایەتی دەکات و رقی لێی دەبێتەوەو لەسەر رێوشوێنی ناڕوات، دژایەتی شوێنکەوتوانیشی دەکات، مرۆڤیش هەیە بەدوای دەکەوێ و رێوشوێنەکەی پەیڕەو دەکات.

## جیاباسی دوەم

## ئەوانەی بەتەمای قەدەر لێی دانیشتون

چینێکی تریش هەبو لەبارەی قەدەرەوە توشی گومڕایی بون، دەیانگوت: مادەم خوا بزانێ چ دەکەین و چ ناکەین و بزانێ سەرەنجاممان دۆزەخە یان بەهەشت و خۆشی بەدیهێنەری کردەوەکانمان بێت.. ئەدی بۆچی کردەوە ئەنجام بدەین و خۆمان ماندو بکەین؟ بۆچی واز لەقەدەر نەهێنین تا خۆی شتەکان بێنێتە دی، چونکە بمانەوێ‌و نەمانەوێ ئەوەی بۆمان خەملێنرابێ هەر دێتە دی.

هەندێ خواپەرست و دنیابەکەمگر و ئەهلی (تصوف)، زێتر بە چاڵی ئەم گومڕاییەدا شۆڕ بونەوەو شتی وایان گوتوە کەم کەس لەو کۆمەلاَنە گوتونی. هێشتاش زۆر لەموسڵمانە فامکاڵ‌و نەزانەکان و گومڕاو زەندیقەکانیش زۆر قسەی لەم چەشنە دەڵێن.[1]

ئەم کۆمەلاَنە بڕوایان بەقەدەر هەیەو بڕوایان هەیە کە خودا بەهەمو شتێك زانایەو هەمو شتێکی بەدیهێناوەو هەڵسوڕانی کاروباری سەرجەم بونەوەر بەویستی خوایە، بەلاَم پێیان وایە هەرچی خوا بەدیهێنابێ‌و ویستبی ببێت پێی رازییەو خۆشی دەوێت، پێیان وایە پێویست ناکا مرۆڤ کردەوە ئەنجام

---

١ بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوي شيخ الإسلام: (٨/٥٩).

بدات و هۆكاران دەكار بێنێ، چونكە هەرچی قەزاوقەدەر نوسیبێتی لە خۆیەوە وەدی دێت، پێیان وایە مرۆڤ بەناچاریو بەبێ دەستی خۆی كردەوەكان ئەنجام دەدات و توانای كاریگەری لەسەر كردەوان نیە، بەڵكو لەئاست قەدەردا وەكو پەڕەموچەی بەرباد وایە، یان وەكو یەكێكە لەشاخێكی بەرز هەڵدێرابێو بەرەو دۆڵێكی قوڵ بەربوبێتەوە، كەهیچی پێ ناكرێ.

ئەم كۆمەڵە وازیان لەكردەوان هێناو پشتی خۆیان لێكردەوە بەو بیانوەی قەدەر لەخۆیەوە دەیهێنێ، كە گوناحیشیان دەكرد دەیانگوت قەدەر وای نوسیوە. گەیشتنە رادەیەك بڕواو بێبڕوایی لێك جیانەكەنەوە، رێنوێن و گومڕایان لێك هاوێر نەكەن، چونكە هەمویان هەر بەدیهێنراوی خودان، ئیدی جیاكردنەوەیان بۆچیە؟!

ئەم بیروباوەڕە قرپۆكە عەقڵێكی زۆری گومڕا كردو لەراستەڕێی لاڕێ كردن و پێوانەی دادو رەوای لێ تێكدان، ئەم بیروبۆچونە هەڵگەڕاو و لادراوە بوە مایەی خامۆشبونی چەندەها وزەی گەورەگەورەی جیهانی ئیسلامیو وای كرد كار نەكەن و كڕكەون، بەڵكو هەندێك جار بەبەرژەوەندی دوژمنانی ئیسلامیش تەواو دەبو.

یەكێك لەئاسەوارەكانی ئەم بیروباوەڕە گەندەڵە ئەوەبو؛ پێیان وابو خودا بێبڕواییو هاوبەشپەرستیو كوشتن و زیناو دزیو ئازاردانی دایك و باوك و چەندان گوناحی تری خۆشویستوەو پێی رازیە، چونكە ئەوان دەڵێن خودا هەر شتێكی هێنابێتە دی خۆشیویستوەو پێی رازی بوە.

ئاسەوارێكیتر ئەوەبو وازیان لەو كردەوە چاك و باشانە هێنا كە بەبەهەشتیان شاد دەكات و لەدۆزەخیان دور دەخاتەوەو چەندین گوناحی گەورەگەورەشیان ئەنجام دەدا، گوایە قەدەر هەر دەبێ بێتە دی! ئەگەر قەدەریش شتێكی نوسیبێ هەر دێتە پێش، جا بۆچی كردەوەو كۆشش بكەین؟!

ئەم جۆرە كەسانە وازیان لەهۆكارەكان هێنا، وازیان لە نوێژو رۆژیو نزاو

کۆمەکخوازیو پشت بەخوا بەستن هێنا، گوایە سودیان نیە، چونکە ئەوەی خودا بیەوێ هەر دێتەدی، ئەوجا نزاو کۆششی بۆچیە؟!

هەروەها زۆربەیان بەستەمی ستەمکارو خراپەی خراپەکاران رازی بون و هەڵوێستیان نەبو، گوایە ئەوەی دەیکەن بەقەدەرو ویستی خودایە.

فەرمان بەچاکەو بەرهەڵستی لەخراپەیان پشت گوێ خست و بایەخیان بە جێبەجێکردنی حەدد و قیصاص نەدەدا، گوایە هەرچی تاوانە بەقەدەری خوایەو دەبو روی بدایە.

شێخلئیسلام ئیبنوتەیمیە (رەحمەتی خوای لێبێ) لەچەندین جێگەی پەرتوکەکەیدا بیروباوەڕو چۆنیەتی ئەم چینەی خستۆتە رو، دەڵێ: ئەوانەی ئیعترافیان بەقەزاوقەدەر کردوەو پێیان وایە لەگەڵ ئەمرو نەهیشدا یەك دەگرێتەوە، ئەوانە کاریان بەوە دەگات کە شەریعەت و ئەمر و نەهی لەکار بخەن. هەرچەندە بڕوایان بە پەروەردگارێتی گشتگیری خواش هەیەو دەزانن کاروباری سەرجەم بەدیهێنراوان لەدەست خوایە، جا ئەمەیە ئەو مەسەلەیە کە زۆر کەس پێی گرفتار بوە کە یان لەروی بیروباوەڕەوەیە یان لەروی کردەوەو کارەوەیە- کە چینێکی زۆری سۆفیو هەژارانی لەخشتە بردوە، تا وای لێهاتوە هەندێکیان حەرامەکان حەڵاڵ بکەن و واجبان لەواجبێتی بخەن و تۆڵەو سزاکان جێبەجێ نەکەن.[1]

هەروەها دەڵێ: ((ئەوانە پێیان وایە خودا بەدیهێنەری سەرجەم بونەوەرە، کردەوەی بەندەکانی بەدیهێناوە، بەدیهێنراوان بەویستی ئەو دەبن، بەڵام لەمەدا بڕواو بێبڕوایی و چاکەو خراپەو رەواو نارەواو رێنوێن و گومڕاو سەرڕاست و سەرگەردان و پێغەمبەرو پێشبین و ستەم و دادو بەدڵ و نابەدڵ و خۆشویستراو و رقێنراو و چاکەو ئازاردانی دایك وباوك و کردەوەی بەهەشتیان و دۆزەخیان و خراپەکاران و چاکەدارانیان لەیەك جیا نەکردۆتەوەو بەیەك چاو تەماشایان کردون.. ئەوان کە دیتویانە هەمو بونەوەر دەچێتە ژێر رکێفی قەزاو

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٢٥٦/٨)

قەدەری پێشین و ویستی کاراو توانای گشتی خوداو بەدیهێنانی سەرتاپایی: بەدیهێنراوانیان بەهاوبەشی دیتوەو لەئاست جیاوازی نێوانیان کوێر بون)).[1]

((هەوادارانی ئەم ڕێبازە هێشتا زیادڕۆیی دەکەن بەشێوەیەك خودی پەیداکراوەکان بەخودا دادەنێن، ئیرادەی قەدەر دەکەنە پاساوی گوناح و تاوانەکانیان، وەکو ئەلحەریری دەڵێ: من بەو پەروەردگارەی سەرپێچی لێدەکرێ بێبڕوام، یان ئیبنوئیسرائیل دەڵێ:

اصبحت منفعلا لما يختاره          مني ففعلي كله طاعات

واتە: (من کارپێکراوی ئەو شتانەم کەخودا منی بۆ هەڵبژاردوە، کەواتە هەمو کردەوەکانم چاك و خراپ- فەرمانبەری کردنی ئەوە).

بەوەش دەڵێ هەقیقەت گوایە ئەوەیە هەقیقەتی پەروەردگارێتی)).[2]

ئیبنولقەییمیش لەپەرتوکە بەهادارەکەی (شفاء العليل)دا گومڕاییەکانی ئەو چینەی خستۆتە ڕو و دەڵێ: (پاشان چینێکی دی سەریان هەڵدا پێیان وابو کردە ئازادەکانی مرۆڤ و نائازادەکانیش- وەکو شنینەوەی دار و درەختەکانە لەبەر (با)دا، یا وەکو جمەی شەپۆلەکان وایە کە بێدەستی خۆیان دەجوڵێن، مرۆڤ لەپەرستن جەبری لێکراوەو لەوەدا ئازادی نیە کە بۆی بەدیهێنراوە. بەڵکو ناچارو زۆری لێکراوە لەئاست کردەوەکاندا.

پاشان کەسانیتر پەیڕەویان لەو ڕێبازە کردو خۆیان دایە پاڵی و شتی تریشیان لێ زیاد کرد، گوایە ئەو ئەرکانەی خوا بەمرۆڤی ڕاگەیاندوە هەمویان لەتوانادا نین، وەکو ئەو ئەرکە وایە بە ئیفلیجێك بڵێن؛ دەبێ بەسەر ئەم حەفت قاتە سەر بکەوی، چونکە بڕواهێنان و پەیڕەوکردنی شەریعەت تایبەت نیە بەکردەوەی بەندەکان، بەڵکو بەکردەوەی بەدیهێنەرەوە پەیوەستە کە توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە، بەندەکانی بەو کردەوانە ئەرکبار کردوە کە لەتوانای مرۆڤاندا نیەو تایبەتە بەخۆی، پاشان سزایان دەدات بێئەوەی بەندەکات

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٦٠)

٢ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٢٥٧).

کردبیان.

پاشان کەسانی تریان لێپەیدا بو گوتیان؛ لەگەردوندا هیچ شتێك نیە سەرپێچیکردنی خوای تێدا بێ، چونکە بکەرەکە بەگوێرەی ئیرادەی خوا کردەوەکانی کردوە. وەکو دەڵێن:

اصبحت منفعلا لما يختاره      مني ففعلي كله طاعات

هەندێك لەمانە کە سەرزەنشتیان دەکرا دەیانگوت ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خواشمان کردبێ، خۆ فەرمانبەرداری ئیرادەکەیمان کردوە. ئەوەی بەرفەرمانی ئیرادەش بێ گازاندەی لەسەر نیەو لەهەقیقەتیشدا ناوبەد نیە.. لێکۆڵەرەوەکانی ئەم بۆچونە پێیان وایە ئیرادەو مەشیئەو خۆشەویستی خوا هەموی یەك شتن و خۆشەویستی خوا کتومت مەشیئەکەیەتیو هەرچی لەگەردوندا هەیە ئیرادەو مەشیئەتی خوای لەسەر بوەو هەرچی ویستویەتی خۆشی ویستوە.

... ئەم چینە بەدترین گومانیان بەخوا بردوەو ناقۆڵاترین ستەمیان داوەتە پاڵ خوا، دەڵێن؛ فەرمان و بەرهەڵستیەکانی خودا وەکو ئەو ئەرکە وایە بە بەندەیەك بڵێیت بەسەر حەفت ئاسمانان بەرز بەوە، وەکو ئەوە وایە پێی بڵێی مردوان زیندو بکەوە، کەچی خوداش سزایەکی زۆر سەختی بەندەکانی دەدات لەسەر ئەو کارانەی نایکەن کە لەتوانایاندا نیەو ئەو کارانەش دەکەن کە ناتوانن نەیکەن، هیچ کەسێکیش نیە کردەوەی بۆ هاسان بکرێ، بەڵکو ناچارو خورتی لێکراوەو هەردەبێ بیانکات یان نەیانکات، بۆیە خواناسەکەیان سرود دەڵێت و سکاڵاو گازاندە لەخوا دەکات و دەڵێ:

القاه في اليم مكتوفا وقال له      إياك إياك ان تبتل بالماء[1]

واتە: قۆڵی بەستەوەو خستیە ناو دەریا      پێی گوت تەڕنەبی وریابە وریا

ئیبنوقنەییم تێگەیشتوە ئەم کۆمەڵە کەسە مەبەستیان ئەوە بوە کە (گوناحەکانیان بخەنە سەر قەدەری خواو خۆیان لەگوناح و تاوان بەپاك

---

[1] شفاء العليل: (ل١٦)

دەرێنن، دەڵێن: گوناح و تاوانیش لەهەقیقەتدا کردەی خوای بەدیهێنەرو زانایە).[1]

پێشکەشکەری پەرتوکی (الشفاء) تێگەیشتوە ئەم هۆیە بوەتە مایەی (رەواج و هەرمێنی بۆچونی جەبری لەهەمو رۆژگاراندا و دەڵێ: بیروباوەڕی جەبری ئەرك و رەنجی مرۆڤ دەخاتە سەر شانی خوای و ئۆباڵی تاوانەکانی لەکۆڵ دەکاتەوە، ئۆباڵ و کۆڵەکە دەخاتە سەر ئەو هێزەی کە ویستی مرۆڤی بزواندوەو پاڵنەری داوەتە بەر ئارەزوەکانی، کە لەو سۆنگەوە کردەوەکانی ئەنجام داوە، بۆیە خەریکبو سەرجەم خەڵکی رەشۆکی رێبازی جەبری بگرنە بەر، ئەوەی بتپەرست بو پێی وابو کاروباری بەدەست ئەو خوایانەیە کە دەیانپەرستێ، ئۆباڵی دەخستە ئەستۆی رۆژگارو پێی وابو رۆژگار گەردان بەمرۆڤ دەکات.

ئەوەی بڕوای بەخودا هەبو بیروباوەڕی وابو قەدەر بەکەیفی خۆیەتی گەردانی پێ دەکات و بەخۆی هیچ ئازادیەکی نیە.

ئەم رێبازە لەسەردەمی نوێدا بەرگێکی مۆدێرنی بەبەردا کراوە، جەبریەکانی ئەم سەردەمە دەڵێن: ئیرادەی مرۆڤ بە غەریزەو بۆماوەو ژینگەوە پەیوەستەو مرۆڤ لە روداوان دەسەلاتی نیە، کەواتە مرۆڤ هیچ ئازادیەکی لەئەنجامدانی تاوان و گوناحەکانی نیە. چونکە ئیرادە هیچ ئاسەوارێکی لەپاڵنەرەکانی دەروندا نیە، بەڵکو خۆی بەروبومی ئەو پاڵنەرانەیە، کە ئەویش ملکەچیەکی ناچاریانەی کاریگەرە دەرونیو دەرەکیەکانە.

ئەنجا لەسەردەمە دواییەنەکاندا کە فیکرەی جەبرییەت لەنێوان موسڵماناندا بلاوبۆوە، ئەویش بەهۆی رێگەی لەئیسلام بەدەرو تەصەووفەوە، هەڵبەت زەبرو زەرەرێکی زۆری بەموسڵمانان گەیاند، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە وازیان لەهۆکارەکان هێنا. هەندێکیان گوتویانە:

---

١ شفاء العليل: (ل١٥)

جرى قلم القضاء بما يكـون فســـيان التحرك والســـكون
جنون منك ان تسعى لرزق ويــرزق في غيابتـــه الجنـــين[1]

هەرچی دەبێ قەڵەم نەخشی لێداوە وەك یـــەكــە چ جوڵەو چ نەجـــوڵاوە
لێی پاڵدەوە، كۆرپەت وا لەبەرچاوە خۆی شێت نەكردو نۆ مانگانیش ژیاوە

قسەو بۆچونی ئەم چینە گومڕایە دەبێتە مایەی بێبڕوابون بەخوداو بەوەی لە كتێبەكانیدا هاتوە، هەروەها دەبێتە مایەی بێبڕوابون بەوشتانەی پێغەمبەران هەواڵیان پێداوە، ئیبنوتەیمیە (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: (ئەوانـەی بڕوایـان بەقەدەر هەیەو فەرمان و بەرهەڵستیان پێ لەكار خستوە، لەوانە زۆر خراپترن كـە فـەرمان و بەرهەڵسـتی دەسـەلمێنن و بڕوایـان بەقـەدەر نیـە، ئـەوە بـەڕای سـەرجەم موسڵمانان و زۆر نەتـەوەی دیكـەی ناموسـڵمانیش چونكە ئەو جۆرە كەسـانە رەواو نـاڕەواو بـڕوادارو بێـبڕواو چاكەكـەران و گوناحبارانیـان فـەرق پێنـەكردوە، بڕوایـان بەهیچ پێغەمبـەرێك و بەهیچ پەرتوكێكی ئاسمـانی نیـە، ئیبلیـس و ئـادەم و، نـوح و گەلەكـەی، موسـاو فیرعـەون، لـەخوا نزیكـان و بێبڕوایانیان لەلادا وەكو یەكە بێ جیاوازی).[2]

هەروەها دەڵێ: (هەركەسێك بڕوا بەزانینی پێشینەی خوا بكات، بەڵام پێـی وابێ دەبێتـە مایـەی دەسبەرداربونی فـەرمان و بەرهەڵستیو لێپاڵدانـەوەو پێـی وابێ كردەوەی پێویست نیە بەو بیانوەی ئەوەی بەختەوەری بۆ نوسرابێ بەبێ كردەوە دەچێتە بەهەشت و ئەوەی بەدبەختی بۆ نوسرابێ بەبێ كردەوە دەچێتە دۆزەخ.. ئەوا ئەو جۆرە كەسـانە لەوانـەش بێبڕواترن كە بڕوایـان بەقـەدەر نیـە، بگـرە گومڕاتریشـن، نـاواخنی قسـەی ئـەو گومڕایانـە لەكارخسـتنی فـەرمان و بەرهەڵسـتیو حـەڵاڵ و حـەرام و هەڕەشـەو بـەڵێنی خوایـە، بۆیـە ئەوانـە لـە جولەكەو فەلەكانیش بێبڕواترن).[3]

---

١ شفاء العليل: (ل٥)
٢ مجموع فتاوي شيخ الإسلام (٨/١٠٠)
٣ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٢٨٨)

هەروەها دەڵێ: (ئەم جۆرە كەسانە ئەگەر لەسەر ئەم بیروباوەڕە گەندەڵەیان بمێننەوە لە جولەكەو گاورەكانیش بێبڕواترن، چونكە جولەكەو دیانەكان بڕوایان بەفەرمان و بەرهەڵستیو بەڵێن و هەڕەشەو پاداشت و تۆڵە هەیە، بەڵام گۆڕیویانەو جێگۆڕكێیان تێدا كردوەو بڕوایان بەهەندێك هێناوەو بەهەندێكیش هیچ.)[1]

## وەڵامدانەوەی قەدەریە جەبریەكان

گومڕایی ئەم چینە لاڕێیە؛ لەچەند روێكەوە وەڵام دەدرێتەوە:

**یەكەم/ لەبەكارهێنانی وشەی جەبر بەهەڵەدا كەوتون:**

ئەم چینە گومڕایە وشەیەكیان بەكارهێناوە نە قورئان و نەسوننەتیش بەكاریان نەهێناوە. هەڵبەت لەسەر مرۆڤ واجبە ئەو وشانە بەكاربێنێ كە قورئان و سوننەت بەكاریان هێناوە. ئەللالەكائی بە ئیسنادی خۆی دەگێڕێتەوەو لە (بقية)دا دەڵێ: دەربارەی وشەی (جەبر) پرسیارم لەئەوزاعی و زوبێدی كردوە؛ زوبێدی گوتی كار و توانای خوا گەلێك لەوە گەورەترە بەجەبرو خورتیكاری بكات. بەڵام خودا چۆنی پێخۆش بێ بەندەكەی ئاوەها تەقدیری دەكات و بەدیدەهێنێ.

ئەوزاعیش گوتی: نەمزانیوە لەقورئان و سوننەتدا وشەی جەبر بنەڕەتێكی هەبێ، بۆیە ناوێرم بەكاری بێنم، بەڵام لەقورئان و فەرمودەدا وشەی (القضاء)و (القدر)و (الخلق)و (الجبل) هەیەو بەكارهاتون.[2]

كۆمەڵێك زانای تری پێشینی وەكو سوفیانی سەوریو ئەبوئیسحاقی ئەلفزاریو هیدیكەش ناڕەزاییان لەبەكارهێنانی ئەو جۆرە وشانە دەربڕیوە.[3]

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٢٦٢)

٢ شرح اصول الاعتقاد: ل٧٠٠،فتاوي٨/١٠٥)

٣ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/١٣٢،٢٩٤،٤٦١)

بۆیە ناڕەزاییان لەوە دەربڕیوە کە بڵێن مرۆڤ جەبری لێکراوە کردەوەکانی بکات، چونکە وشەی جەبر بەتێکڕاییە، ڕەنگە (ئیکراه: ناچار)ی پێمەبەست بێ.

بۆنمونە دەڵێن: (اجبر الاب ابنته علی النكاح: بابەکە کیژەکەی ناچار کرد شو بکات). یان دەڵێن: (جبر الحاكم الرجل علی بيع ماله لوفاء دينه: دادوەرەکە پیاوەکەی ناچار کرد ماڵەکەی خۆی بفرۆشێ تا قەردەکەی پێبداتەوە). جا لێرەدا وشەی (ئیجبار) بەواتای (ئیکراه) دێت. کەواتە کە دەڵێن: (اجبر الله العباد) واتە خوا بەندەکانی ناچار کردوە کردەوەکان بکەن و وای فەراهەم نەهێناوە بەویست و خۆشەویست و پێ‌ڕازیبونی خۆیان کردەوەکانیان هەڵبژاردبێ، هەڵبەت بەکارهێنانی ئەم وشەیە بۆ خوا هەڵەیەکی ئاشکرایە، چونکە خودا زۆر لەوە بەرزترو شکۆمەندترە هیچ کەسێك بخاتە بەر جەبر، بەڵکو خودا توانای هەیەو وا لەبەندەکانی دەکات کردەوەکانیان بەرەزامەندیو بەدڵی خۆیان بوێت، کەواتە چۆن دەبێ وشەی جەبرو ئیکراه بۆ خوا بەکار بهێندرێت و. بەو جۆرەی لێ بکەین هەروەك چۆن بەدیهێنراوێك بەدیهێنراوێکیتر ناچار دەکات تا کارێك ئەنجام بدات.[1]

بەلام ئەگەر وشەی جەبر بەمەبەستی ئەوە بەکار بێت کە خودا چی لەبەندەکان بوێ ئەوەیان دەوێت و بەبێ خورتیو ئیکراهیش ئەنجامی دەدەن ئەوە ڕاستە، هەندێ زانای پێشینیش گوتویانە (الجبار) واتە ئەو خودایەی بەندەکانی ناچار کردوە بۆ ئەوەی دەیەوێت.[2]

جا لەبەر ئەوەی وشەی جەبر زاراوەیەکی تێکڕایە بۆ هەردو مەبەست بەکاردێت، بۆیە زانایانی پێشین بەرهەڵستیان لە بەکارهێنانی کردەوە چ بە ئەرێو چ بەنەرێ.

شێخلئیسلام دەڵێ: ئەبوبەکرلخەلال لە پەرتوکەکەیدا (السنة) دەڵێ: مەرزەوی بە ئیمام ئەحمەدی گوت: ئەبو عەبدوڵلا! پیاوێك هەیە دەڵێ خودا

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٤٦٣)

٢ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٤٦٤)

بەندەکانی ناچار (جەبر) کردوە، ئەویش گوتی: ئێمە ئاوەها نالێین و ناڕەزایی لەو وشەیەدا دەردەبڕم، گوتی: ئێمە دەڵێین خودا کێی بوێ گومڕای دەکات و کێشی بوێ ڕێنوێنی دەکات.

مەرزەوی دەڵێ: پیاوێك گوتی؛ خودا کەسی ناچار نەکردوە گوناحان بکات، یەکێکیتر وەڵامی داوەو گوتی: بەڵێ، خودا بەندەکانی ناچار کردوە. مەبەستی لەوەبوٚ قەزاوقەدەر بسەلمێنێ هەیە. لەم بارەوە پرسیان بەئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پێشەوا کرد، ئەویش ناڕەزایی لەهەردوکیان دەربڕی، چونکە وشەی جەبریان بەکارهێنا بو، هەندێ قسەی لەگەڵ کابرای یەکەم کرد تا پەشیمان بوٚوە، پاشان پێی گوت: بڵێ خودا کێی بوێ گومڕای دەکات و کێشی بوێ ڕێنوێنی دەکات.

ئەبو ئیسحاقی فەزاری دەڵێت: ئەوزاعی هاتە لام و گوتی ئەم دو پیاوە هاتونە لام لەبارەی قەدەرەوە پرسیان پێکردوم، منیش حەزم کرد بیانهێنمە لای توٚ تا گوێیان بوٚبگری و وەڵامیان بدەیەوە.

منیش گوتم: خوا رەحمت پێبکا خوٚ ئەتوٚ لەمن شایەنتری.

دەڵێ: ئەوزاعی هەردو پیاوەکەی هێناو گوتی قسە بکەن.

گوتیان: هەندێ کەس هاتنە لامان و مشتومڕیان لەبارەی قەدەرەوە دەکردو ئێمەش وەڵاممان دەدانەوە، گفتوگوٚ گەرم بو تا گەیشتە ئەوەی ئێمە گوتمان؛ خودا جەبری لێ کردوین لەوشتانەی بەرهەڵستی لێکردوین، ئیدی کەلێن کەوتوٚتە نێوان ئێمەو ئەو فەرمانانەی پێمانی کردوەو رزقی داوین بەو شتانەی لێی حەرام کردوین.

منیش گوتم: گەلوٚ! ئەوانەی کە هاتونە لاتان و مشتومڕیان کردوە، بیدعەیان هێناوەتە ئارا و شتێکی تازەیان لەدین پەیدا کردوە، بەڵام ئێوەش لەبەر بیدعەی ئەوان دەرچون و توشی بیدعەیەکی هاوشێوە هاتون.

ئەوزاعی گوتی: ئەبو ئیسحاق! قسەکەت زوٚر جوانەو راست دەفەرموی.[1]

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (١٠٣/٨)

**دوەم: ئینکاریکردنی ئازادی هەڵبژاردنی مرۆڤ بۆ کردەوەکانی: خۆ بێ عەقڵ کردنە.**

ئەوانەی پێیان وایە مرۆڤ لەئاست کردەوەکانیدا ویستی نیە؛ ئەوا عەقڵی خۆیان پێشێل کردوەو خۆیان و خەڵکیشیان بەگومڕاییدا بردوە، دەنا هەمومان دەزانین جوڵانەوەو بزاوتنی ئێمەی مرۆڤ هاوشێوەی دارو بەردو بێگیانان نیە کە هیچ شتێکیان بەدەست خۆ نیە.

تەنانەت جوڵەو بزاوتە خۆویست و خۆنەویستەکانی جەستەشمان لێك جیا دەکەینەوە، بەوێنە: لێدانی دڵ، جوڵانی سییەکان، سوڕی خوێن . هەزاران کرداری ئاڵۆزیتر بگرە کە خۆنەویستانە لەجەستەمان رو دەدەن، هێندێکیان هەر نەدۆزراوەتەوە، هەمو ئەم جوڵانانە ئازادی هەڵبژاردنی مرۆڤی تێدا نیە، بەڵکو چەند کردەو جوڵەیەکن بەبێ دەسەڵاتی مرۆڤ رودەدەن و ویستی مرۆڤ پشکی تێدا نیە، هەروەها ئەو کەسەی لەرزەك بوە خۆ ئەویش ناتوانێ لەرزەکەی نەهێڵێ، واتە ئەویش هەر بەبێ ویستی ئازادانەی مرۆڤ رودەدات.

بەڵام خواردن و خواردنەوەو هەڵسان و دانیشتن و کڕین و فرۆشتن و ژن هێنان و تەڵاقدان و جۆرەها کرداری تری مرۆڤ هەمویان بەویست و توانا رودەدەن، کەواتە ئەوانەی ئەم توانستە لەمرۆڤ دادەبڕن عەقڵیان سەرگەردان کردوەو رەش و سپیان تێکەڵ بەیەك کردوە.

قورئانی پیرۆز چەندین ئایەتی لەو بارەوە تێدایە کە کردەوەکان دەداتە پاڵ مرۆڤ، لەوانە:

﴿ وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى: پیاوێك لەپەرگەی ئەوسەری شاردا بەخێرایی هات ﴾.[1]

﴿ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ: کە ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی ئامادەو ملکەچ

---

[1] يس ٢٠

بون و ئیبراهیم لارومەتی ئیسماعیلی خستە سەر زەوی ﴾.[1]

﴿ فَوَكَزَهُ مُوسَى فَقَضَى عَلَيْهِ: موسا مستێکی لێداو کوشتی ﴾.[2]

﴿ فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ فِي زِينَتِهِ: قارون بە تەنتەنە و کەشم و نەشمەوە هاتە دەرێ بۆ ناو گەلەکەی ﴾[3].

هەروەها چەندین ئایەتیتر لەم بارەوە هەن، کەزۆر زەحمەتە هەژمار بکرێن و ئامارژە بۆ ئەوە دەکەن کە مرۆڤ خاوەنی کردەوەکانی خۆیەتی کە پێیان هەڵدەستێ.

**سێیەم: پێیان وایە هەرچی خوا تەقدیری کردووە بەدیهێناوە خۆشیویستووە پێی رازیە.**

هەڵبەت ئەو جۆرە گوتانەش گوتەیەکی پوچە، راستە خوا ویستوێتی بێبڕوابێو هاوبەشپەرستێتیو گوناح و تاوان و داوێن پیسیو دزیو ئازاردانی دایك و باوك و درۆو قسەی هەڵبەستراو و بەناهەق خواردنی ماڵی خەڵکی بەناحەق و... ئەو شتانە هەبێ، بەڵام خوا رقی لەو شتانە دەبێتەوەو پێیان تورە دەبێو فەرمانیشی بە بەندەکانی کردوە توخنیان نەکەون.

ئیبولقەییم دەڵێ: (شێخلئیسلام خوا روحی پیرۆز کا- پێی گوتم؛ جارێکیان سەرزەنشتی ئەو کەسانەم کرد کە ئەو شتانەیان خۆش دەوێت کە خواو پێغەمبەر پێیان ناخۆشە.. یەك لە سەرزەنشتکراوان گوتی: خۆشویستن ئاگرێکە هەرچی لەدڵدا بێت دەیسوتێنێ تەنها مەرامی خۆشەویستەکەی نەبێ، ئەوەی لەگەردونیشدا هەیە مەرامی خودا بوە، کەواتە چ شتێکی لێ ببوغزێنم؟

شێخیش پێی گوت: باشە ئەگەر خودا لەکەسانێك تورە بوبێو سەرزەنشت و نەفرەتی لێکردبن، تۆش خۆشەویستیت بۆ دەربڕین و خۆشتویستن و کردەوەکانیانت بەدڵ بو و پێیان خۆشنود بوی، ئایا دۆستایەتی خوات کردوە یان دوژمنایەتی خوا؟

دەڵێ: جەبریەکە بە سەرسامیەوە دەمکوت بو و وشەیەکی لەدەم نەهاتە

١ الصافات ١٠٣ ٢ القصص ١٥ ٣ القصص ٧٩

دەرێ).[1]

لەو جێباسانەی پاشان دادێت کە تێیدا باسی ئیرادەی کەونیو ئیرادەی شەرعی دەکەین زێتر بەو بابەتەدا شۆڕ دەبینەوە.

**چوارەم: پێیان وایە (بڕواهێنان بەقەدەر) مایەی دەستبەرداربونی کردەوان و فەرامۆشکردنی هۆکارانە:**

ئەم چینە لەوەش بەهەڵەدا کەوتون کە پێیان وایە ئەگەر یەکێك بڕوا بەقەدەر بێنێ پێویستی بەکردەوان نامێنێ.

بەڵام ئەوانە لەحەقیقەتی قەدەر بێئاگان، چونکە خودا ئەنجام و هۆی خەملاندوە. خودا ئاکامی بەبێ هۆ تەقدیر نەکردوە. هەرکەسێکیش بڵێ خودا ئاکام و ئەنجامی بەبێ هۆکارو پێشینە تەقدیر کردوە؛ ئەوا بوختانێکی گەورەی بەخوا هەڵبەستاوە.

خودا کە بژێوی بۆ یەکێك تەقدیر کردوە، لەهەمان کاتدا هۆکارەکانیشی بۆ تەقدیر کردوە کە ئەو بژێویەی پێ وەدەست دێت. بۆیە ئەوانەی دەڵێن: کاکە پێویست ناکا بۆ بژێوی کردوکۆشان بکەی، ئەوەی بۆت تەقدیر کراوە هەوڵ دەی یان دانیشی هەر بۆت دێ. بێگومان ئەوانە لەقەدەری خوا نەگەیشتون. بۆیە قسەی ئاوها دەکەن. ئەگەر خودا بۆ کەسێك تەقدیری کردبێ منداڵێکی پێ ببەخشێ، ئەوەشی تەقدیر کردوە ژن بێنێو لەگەڵ ژنەکەی هەڵبکات، چونکە هۆکارەکانیش هەر لەقەدەری خوان.

خودا کە تەقدیری کردوە کە فلان کەس دەچێتە بەهەشت، لەگەڵ ئەمەدا ئەوەشی تەقدیر کردوە کە ئەم مرۆڤە بڕوا دێنێو کردەوەی چاك دەکات و لەسەر ئیسلام راستەڕێ دەبێ، بۆ دۆزەخیەکەش بەهەمان شێوە کە تەقدیری کردوە دەچێتە دۆزەخ، ئەوەشی تەقدیر کردوە کە بڕواناهێنێ و کردەوەی چاك ناکات.

---

[1] شفاء العليل ل١٦

خوا تەقدیر دەکات فلان کەس نەخۆش دەکەویٚ و دەرمان دەخوات و چاك دەبیٚتەوە. لیٚرەدا خودا هەم نەخۆشیەکەو هەم لابەری نەخۆشیەکەشی تەقدیر کردوەو ئەوەشی تەقدیر کردوە کە دەبیٚتە مایەی چاکبونەوە.

خودا تەقدیری کردوە فیسارەکەس لەبەری دەپاریٚتەوەو داوای کۆمەکی لیٚدەکات، ئەویش نزاکەی گیرا دەکات. هەروەها تەقدیر دەکات فیسار کەسیش لیٚی ناپاریٚتەوەو داوای یارمەتی لیٚ ناکات، بۆیە خوداش یارمەتی نادات و لەناو تەنگانەکەدا گیری پیٚ دەخوات.

جا هەمو شتەکان بەم شیٚوەیەن، خودا ئەنجام و هۆکاران پیٚکەوە تەقدیر دەکات. جا هەرکەسیٚکیش بلیٚ ئەنجامەکان بەبیٚ هۆکار دیٚنەدی؛ ئەوە لەدینی خوا نەگەیشتوەو قەدەری خوای نەناسیوە، وەك ئەوە وایە کە بلیٚ منداڵ بەبیٚ هۆکار پەیدا دەبیٚ، کشتوکاڵ بەبیٚ ئاو و خاك شین دەبیٚ، تیٚربون بەبیٚ خواردن و تینویٚتی شکاندنیش بەبیٚ ئاوخواردنەوە رودەدەن.

ئایەت و فەرمودەش لەم بارەوە گەلیٚ زۆرن، لە چەندین جیٚگەدا فەرمانمان پیٚدەکەن کە لەهەمو کاروبارەکانی ژیانماندا هۆکاری رەوا بگرینە بەر و بۆ پەیداکردنی بژیٚوی کردوکۆشش بکەین و بۆ بەرانگژبونەوەی دوژمنان چەك و تفاق ئامادە بکەین و بۆ گەشت و گوزەرانیش تیٚشو هەڵگرین.

خودا دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ: ئەگەر نویٚژی هەینیتان کرد، ئەوجا بەزەویدا بلاوببنەوەو کردوکۆشش بکەن تا بژیٚویتان پەیدا بکەن ﴾.[1]

﴿ فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ: بەکەنارەکانی زەویدا بگەریٚن و لەبژیٚویەکەی بخۆن ﴾.[2]

﴿ وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ: تا پیٚتان دەکریٚ چەك و جبەخانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیداکەن

---

١ الجمعة ١٠ ٢ الملك ١٥

تاوەکو دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتان بتۆقێنن ﴾.[1]

﴿ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى: بەحاجیەکان دەڵێ؛ تێشو بۆ ڕێی حەج ساز بکەن، بشزانن باشترین تێشو پارێزکارییو لەخواترسانە ﴾.[2]

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ: پەروەردگارتان گوتویە: لەبەرم بپاڕێنەوە. ئەوسا بەدەنگتانەوە دێم ﴾.[3]

﴿ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا: موسا بەگەلەکەی گوت: کۆمەکخوازی هەر لەخوا بکەن و ئارام بگرن ﴾.[4]

هەروەها خودا فەرمانی کردوە هۆکاری شەرعی وەکو نوێژو ڕۆژو و زەکات و حەج بگرینەبەر کە مایەی ڕەزامەندی خودای پەروەردگارن.

ژیانی پێغەمبەرﷺ، بەڵکو ژیانی سەرجەم پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیشیان ئاشکرایە کە هۆکارەکانیان گرتۆتە بەرو کۆششێکی زۆریان کردوە.

بەکارهێنانی هۆکارەکانیش هەر لەقەدەری خوا دایەو لەگەڵ یەکدا ناکۆك و ناساز نین.

پێغەمبەر ﷺ یارانی لە قەدەر حاڵی کردوەو تێی گەیاندون کە نابێ کردەوە فەرامۆش بکرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە؛ هەرکەسێك بیەوێ ئاواتەکانی وەدی بێنێ دەبێ هەوڵ و تەقەڵلا بدات. یاوەران لە پێغەمبەرﷺیان پرسی مادەم قەڵەم نەخشی لێدابێو کردەوەکانمان لەقەدەردا بڕابێتەوەو خودا کاری لەکار تەواو کردبێ، تەقەڵلادان سودی چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((اعملوا فكل ميسر لما خلق له: کردەوەی چاك بکەن، چونکە هەرکەسێك ئەو کارەی بۆ ئاسان دەکرێت کە بۆ ئەنجامدانی بەدیهێنراوە))، پاشان ئەم ئایەتانەشی خوێندەوە: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى: کێ لەئێوە دەبەخشێ و لەخوا

---

١ الانفال ٦٠

٢ البقرة ١٩٧

٣ غافر ٦٠

٤ الاعراف ١٢٨

ترسا، بە پاداشتی هەرەباشیش بڕوای هەیە، بەرەو جێگەی خۆشی و حەسانەوە ڕێی هاسان دەکەین، بەڵام ئەوی ڕژدی کرد و گوتی: کارم بە کەس نیە، پاداشتی هەرەباشیشی پێ درێو بو، ڕێگە هەرە دژوارەکەی دەخەینە بەر﴾.[1]

یاوەران لە مەبەستی خواو پێغەمبەرەکەی تێگەیشتن و چاك لەو فەرمودانەی دەربارەی قەدەر هاتون حاڵی بون، بۆیە هەندێکیان گوتیان: (قەت وەکو ئێستا تەقەڵلام نەداوە)

ئەوەی لەقەدەری خوا گەیشتبێ دەزانێ قەدەری پێشینە نابێتە مایەی لێدانیشتن و پاڵدانەوە، بەڵکو پتر هانی دەدات تەقەڵلا بدات و کردەوان ئەنجام بدات، هەروەها پتریش مکوڕ دەبێ تا قازانج و بەرژەوەندی دنیاو ئاخیرەت وەدەست بێنێ.

بەڵام لێرەدا دەبێ لەوە ئاگادار بین کە مرۆڤ نابێ تەنها متمانە بکاتە سەر هۆکارەکان و هەر پشت بەوان ببەستێ، بەڵکو دەبێ پشت بەخوای بەدیهێنەرو پەیداکەری ببەستێ.

زانایانمان گوتویانە: (روکردنە هۆکاران هاوبەش دانان و هاوەڵ پەیداکردنە لەیەکخواناسیدا، فەرامۆشکردنی هۆکارەکانیش بێئەقڵیە، رو وەرگێڕانی یەکجاریش لەهۆکاران برینداركردنی شەرعە، بەڵام پشت بەخوا بەستن و تەمابون بەخوا لەگەڵ دەستگرتن بە هۆکارەکانەوە، هەر دوکیان یەکخواناسیو عەقڵو شەرع دەیانخوازێو پێویستیان دەکات.

رونکردنەوەی ئەمەش بەم جۆرەیە؛ روکردنە هۆکاران ئەوەیە کە دڵ متمانەی لەسەر بکات و تەمای پێ هەبێو لێی رابپەڕموێ، هەڵبەت هیچ بەدیهێنراوێکیش نیە شایەنی ئەوەبێ، چونکە سەربەخۆ نیە، بەڵکو حەتمەن دەبێ هاوبەش و هاودژێکی هەبێ، لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ئەگەر خودا رامی نەکا رام نابێت، ئەمەش ئەوە رون دەکاتەوە کە خودا بەدیهێنەرو خاوەنی هەمو

---

[1] الليل ٥-١٠

شتێکە، کەواتە ئەرزو ئاسمان و گەردونیش دەبێ خودایەك هەبێ بەدیهێنەری بێت، هەرشتێك گەردون و هەسارەو فریشتەو شتیتر بیکەن، قەت نیە بەتەنیا ئەنجامی بدەن، بەڵکو حەتمەن دەبێ هاوبەش و یارمەتیدەریان هەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا نەیار و لەمپەریان هەیە.)[1]

(هەمو هۆکارێك هاوبەش و هاودژی هەیە، ئەگەر هاوبەشەکەی یارمەتی نەدات و هاودژەکەی لەکۆڵ نەکاتەوە، هۆکارەکە نایەتەدی، باران قەت بەتەنیا خۆی شت ناڕوێنێت، بەڵکو دەبێ هەواو خاك و شتی تری لەگەڵدا بەشدار بێ، کشتوکاڵیش ئەگەر نەخۆشیە کوشندەکانی لێ دور نەخرێتەوە گەشە ناکات، خواردنیش بەبێ ئەندامەکانی لەش ناخورێ، هەمو ئەوانە ئەگەر لەمپەرەکانیان لانەدرێن سودی نابێ).[2]

مرۆڤە هۆشمەندەکان دەزانن ئەو شتەی دەیانەوێ هەر بەتەنیا بەخۆیان ناکرێ، بۆیە زۆربەی کارەکان هۆکاریشی بۆ سازو ئامادە دەبێ، کەچی زۆرجاران ناشکاتە ئەو مەبەستەی کە هەوڵی بۆ دەدا.

﴿حَتَّى إِذَا أَخَذَتْ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ: تا ئەو کاتەی زەمین ڕەنگاوڕەنگ دەبێت و خۆجوان دەکا و خەڵکی لایان وایە لە دەستەڵاتی واندایە، هەتا کاتێ فەرمانی ئێمەی دێتە سەر جا بەشەو یان لە ڕۆژێدا– ئاوا وەکو درەوکراوی لێدەکەین، هەروەك دوێنێ هەر نەبوبێ.﴾[3]

ئەلالەکائی دەڵێ: جارێکیان پیاوێك داوای لەکەنیزەکەی کرد ئاوی بۆ بێنێ، ئەویش پەرداخێکی شوشەی بۆ هێناو ئاوی بۆ تێکرد، ئەویش لەسەر کۆشی خۆی دانا. پاشان بۆ دەمی بردو گوتی: هەندێ کەس وا گومان دەبەن من ناتوانم ئەو پەرداخە ئاوە بخۆمەوە، شەرت بێ ئەگەر نەمخواردەوە ئەم کەنیزەیە

---

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (١٧٠/٨)

٢ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (١٦٧/٨)

٣ يونس ٢٤

ئازاد بکەم. کەنیزەکە کە ئەمەی گوێ لێبو چمکی کراسەکەی لەپەرداخەکە دا و بەسەر کراسی کابرای رشت و پەرداخەکەش بەربۆوەو شکا.[1]

بەم جۆرە کەنیزەکە ئەو داماوەی تێگەیاند کە ئەگەر خودا شتێکی تەقدیر نەکردبێ، با ئەویش بیەوێ، بۆی ناکرێو نابێ، پەندێکی وای دایێ قەت لەبیری نەکات، کەنیزەکەش خۆی لەکۆیلەیی ئازاد کرد.

چەندین دەوڵەمەندو بەهێزو پێشڕەو هەبون وایان دەزانی ئیتر تەواو ڕێشمەی دنیایان کەوتۆتە دەست، کەچی لەبەر دوژمنێك یان لەبەر نەخۆشیەك یان لەبەر برادەرێکی ناپاك یان لەبەر هەر هۆکارێکیتر دەستەوسان بون و ئاواتەکانیان نەهاتۆتە دی؛ ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ: لەنێوان ئەمان و ئارەزوەکانیاندا بەربەست دانرا ﴾.[2]

### پێنجەم: پاساو دانەوەیان بەقەدەری خوا:

ئەم جۆرە کەسانەی کە قەدەری خوا دەکەنە بیانو و پاساوی چاکە نەکردن، ئەگەر یەکێك پێیان بڵێ وەرە نوێژ بکەو ڕۆژو بگرەو قورئان بخوێنە، دەڵێ: ئەگەر خوا ویستی لەسەر ببوایە دەمکردن.

لەهەمان کاتیشدا بۆ پاساودانەوەی ستەم و زۆرداریو خراپکاریش هەر بیانویان بە قەدەر دێنایەوەو دەیانگوت: چ بکەین؟ ئەوە قەدەرو ویستی خوا وایە! بەم جۆرە وایان لێهاتبو خۆیان لەهەمو ئەو ناڕەواو خراپکاریانە گێل بکەن کە لەخاکی ئیسلامیدا رویان دەدا.

بۆیە ئەم کۆمەڵە کەسانە دەچنە ژێر باری ستەمکاران و ملکەچی ستەمەکەیان دەبن، تەنانەت هەندێکیان دەبنە یارمەتکاری ستەمکارانیش و دەڵێن؛ خەڵکینە، هەر ئەوەتان پێ دەکرێ لەسەر قەدەرو ویستی خوا ئارام بگرن. هیوایان هەیە گوناحی گەورەگەورەو تاوانی ناقۆڵا ئەنجام دەدات، گوایە

---

١ شرح اصول السنة: ٧٢٧

٢ سبأ ٥٤

کاری قەدەرە! پێیان وایە هەر شتێك رو بدات قەدەری خوایەو هیچ بەدەستی وان نیە، شتی وایان لێدەگێڕنەوە پیاوی هۆشمەندو ژیر هەر پێبکەنێ، خۆیان هاویشتۆتە ناو گەرداوێك دەربواریان نەبێ.

ئیبنولقەییم هەندێ روداویان لەبارەوە دەگێڕێتەوە مەگەر لەئاژەڵ بوەشێتەوە.. دەڵێ: جارێکیان پیاوێك لەو جۆرە کەسانە کوڕە نۆکەرەکەی دیت خەریکی کەنیزەکەیەتی، ویستی سزایان بدات، بەڵام کوڕەکە دەیزانی پیاوێکی قەدەریە، بۆیە گوتی: چ بکەین قەزاوقەدەر وازی لێنەهێناین تا وای لێکردین.

کابرای گەمژە گوتی: مادەم ئەو زانیاریەت لەبارەی قەدەرەوە هەیە، ئەوەم لەهەمو دنیا پێ خۆشترە، بڕۆ لەپێناوی خودا ئازاد بە.

یەکێکی‌تر دیتی وا پیاوێك خەریکی ژنەکەیەتی، ژنەکەی دا بەر لێدان و کوتانێ، ژنەکەش هاواری دەکرد چ بکەم قەزاوقەدەر بو.

گوتی: هەی دوژمنی خوا قەزاوقەدەر دەکەیە بیانو؟!

ژنەکە گوتی: ئەیڕۆ! رێبازی سوننەتت واز لێهێناوەو چویە سەر مەزەبی ئیبنوعەباسی؟

کابرا هەڵوەستەی کردو قامچیەکەی فڕێدا و پۆزشی خواست و گوتی: بمبورە، ئەتو نەبای گومڕا دەبوم.

یەکێکی‌تر دیتی وا پیاوێك خەریکی ژنەکەیەتی، گوتی: ئەوە چیە ئافرەت؟

گوتی: قەزاوقەدەرە.

ئەویش گوتی: (الخيرة فيما قضى الله: خێر لەوەدایە خوا تەقدیری کردوە).

ئیتر لەپاش ئەوە ناسناویان کردە (الخيرة فيما قضى الله).[1]

ئەگەر پاساو هێنانەوەی قەدەری خوا بەم جۆرە راست بوایە ئەوا هەمو کەس بۆی هەبو بکوژێو ببڕێو بدزێو بچەوسێنێتەوە، ئەگەر پێشی بڵێن: بۆچی وادەکەی؟ دەڵێ: قەدەرە.

گومان لەوەدا نیەو هەمو هۆشمەندێکیش دەزانێ ئەم جۆرە بڕوبیانوانە

---

١ خاوەنی معارج القبول لە(٢/٢٥٥)دا ئەم روداوانەی لەئیبنولقەییم راگواستۆتەوە.

لەراستیەوە دورن و کەس قبوڵیان ناکات، ئەگەرنا ژیان وێران و گەندەڵ دەبو.

خۆ زۆربەی قەدەریەکانیش ئەگەر ستەمیان لێکرابا هەڵدەچون و بەرگریان دەکردو بەوەش رازی نەدەبون پێیان بگوترابوایە؛ قەدەری خوایە.

ئێمە دەبێ بەگوێرەی ئەو بۆچون و رێوشوێنەی کە زاناکانمان بۆیان رەنگرێژ کردوین بڕوا بەقەدەری خوا بێنین، بۆمان دروست نیە قەدەری خوا بکەینە هۆی بێ هەوڵیمان وەك چۆن دروست نیە بیکەینە بڕوبیانوی لارێبونیشمان. بەڵکو بەڵگەی قەدەر هێنانەوە تەنها لەسەر ناخۆشیەکان دەبێت، نەك لەسەر عەیبەکان.

شێخلئیسلام (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: (مرۆڤ لەئاست قەدەردا لە دو حاڵەتان دایە؛ حاڵەتی پێش قەدەرو حاڵەتی پاش قەدەر. لەپێش قەدەرەکەدا دەبێ کۆمەکخوازیی لەخوا بکات و پشت بەو ببەستێو لەو بپارێتەوە، جا ئەگەر قەدەرەکە بەپێی کردەوەی ئەو نەبو، پێویستە ئارام بگرێ، یان پێی رازی بێ، ئەگەر بەپێی کردەوەکەی ئەویش بو، ئەوە بەخششێکی خودایەو پێویستە سوپاسی خوا بکات. ئەگەر گوناحیش بو ئەوا دەبێ داوای لێخۆشبون بکات.

لەئاست فەرمایشتەکان دو حاڵەت هەیە؛ حاڵەتێکیان ئەوەیە بەرلەوەی کردەوەکە ئەنجام بدات، دەبێ عەزمی هەبێو کۆمەکخوازیی لەخوا بکات تا کردەوەکەی جێبەجێ بکات. حاڵەتەکەی تریش دوای کردەوەکەیە، داوای لێخۆشبون لەخوا بکات ئەگەر کەمتەرخەمی هەبوبێ، سوپاسی خواش بکات ئەگەر خوا چاکەیەکی پێ بەخشی بو.

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ: ئارام بگرە بەڵێنی خوا راستەو دێتەدی، داوای لێخۆشبونیش بۆ گوناحەکانت بکە ﴾.[1]

خوا فەرمانی پێکردوە ئارام لەسەر ناخۆشیەکانی قەدەر بگرێو لێبوردنخوازیی بۆ گوناحەکانی بکات.

---

١ غافر ٥٥

**خودا دەفەرموێ**: ﴿ وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِــــنْ عَــزْمِ الأُمُــورِ: **ئەگەر ئارام بگرن و لەخوا بترسن، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە** ﴾.[1]

﴿ إِنَّهُ مَـــــنْ يَتَّــقِ وَيَصْــبِرْ فَـــإِنَّ اللَّـــهَ لاَ يُضِيــعُ أَجْــرَ الْمُحْسِــنِينَ: **ئەوەی لەخوا بترسێ‌و ئارام بگرێ، ئەوا پاداشتی لەلای خوایەو خوداش پاداشتی چاکەکاران بەفیڕۆ نادات** ﴾.[2]

**لەم ئایەتانەدا باسی ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی‌و خۆپاراستن لە گوناهان بەیەکەوە هاتون.**

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ**: ((احرصْ على ما ينفعك واستعنْ بـــالله ولا تعجـــز، وان أصابكَ شيء فلا تقلْ لو أني فعلتُ كان كذا وكذا، ولكن قل: قَدَرُ الله وما شاءَ فعل، فـإنَّ لَوْ تفتحُ عملَ الشيطان: **مكوڕ بە لەسەر ئەو شتەی سودت پێ دەگەیەنێ‌و کۆمەکی لەخوا بخوازەو دەستەوسان دامەنیشە. ئەگەر شتێکت بەسەرهات مەڵێ خۆزگە وام بکردبایەو وام نەکردبایە، بەڵکو بڵێ: ئەوە قەدەری خوایەو چی ویستوە ئەوە هاتۆتە دی. چونکە وشەی ئەگەرو خۆزگە کردەوەی شەیتانەکان واڵا دەکات**)).[3][4]

**بەندەی بڕواداری هۆشمەند بەبیانوی بڕانەوەی قەدەر کردەوە چاکەکان فەرامۆش ناکات، بەڵکو ئەوە دەزانێ کە لەسەری واجبە کارەکانی بەپوختەیی و پتەوی بەڕێوە ببات، دەزانێ خودا چی لێ دەوێت و چ شتێك سودو قازانجی پێ دەگەیەنێ‌و چ شتێکیش زیان و زەرەر، پاشان ئەوپەڕی کۆششی خۆی تەرخان دەکات تا فەرمانی خوا راپەڕێنێ، ئەو هۆکارانەش دەگرێتەبەر کە پێی وایە کارە چاك و بەسودەکەی پێ وەدی دێ، ئەگەر سەرکەوتوش نەبو ئەوا کات و وەختی خۆی بەخەم و خەفەت و ئەفسوسان(تأسف) ناباتە سەر، بەڵکو لەم**

---

١ آل عمران ١٨٦　　　٢ يوسف ٩٠

٣ رواه مسلم في صحيحه عن ابي هريرة: (٤/٢٠٥٢) ورقم الحديث(٢٦٦٤).

٤ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: ٨/٧٦.

کاتەدا دەڵێ: خوا هێناویەتیو قەدەرو ویستی خوایە.

بڕوابون بەقەدەری خواو بەڵگەهێنانەوە پێی؛ دەبێتە ڕێگەچارەو دەرەتانی ئەو گرفت و گرێ دەرونیانەی لەکاتی شکست و سەرنەکەوتندا توشی مرۆڤ دەبێت، خۆ ئەگەر بەپوختی لەقەدەر بگات هەرگیز بۆی نابێتە لەمپەری کارکردن و هەوڵدان، بەڵکو بەپێچەوانەوە.

**بەڵگەهێناوە بەو فەرمودەیەی کە ئادەم قەدەری تێدا دەکاتە بیانو:**

ڕەنگە کەسانێکی کەم زانست بۆ پاساوی نەنگیەکانیان فەرمودەی بەڵگەخوازیەکەی ئادەم بهێننەوەو بیکەنە پارسەنگی قسەکانیان.

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((احتج ادم وموسى عليهما السلام عند ربهما، فحج ادم موسى. قال موسى: أنت آدم الذي خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأسجد لك ملائكته، وأسكنك في جنته، ثم أُهْبط الناس بخطياتك الى الأرض؟ فقال أدم: أنت موسى الذي اصطفاك الله برسالاته وبكلامه، وأعطاك الألواح فيها تبيان كل شيء، وقرّبك نجيًا، فبكم وجدت الله كتب التورات قبل ان أخلق؟ قال موسى: بأربعين عاما. قال آدم: فهل وجدت فيها: وعصى آدم ربه فغوى؟ قال: نعم. قال: افتلومني على أن عملت عملا كتبه الله عليَّ أن أعمله قبل أن يخلقني بأربعين سنة؟ قال رسول الله ﷺ: فحج آدم موسى:

ئادەم و موسا (سەلامی خوایان لێبێ) لەلای خودا کردیانە گفتوگۆو بەڵگە هێناوە. موسا گوتی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خودا بە هەردو دەستانی بەدیهێنایو لەروحی خۆی فوی پێداکردیو فریشتەکان سوژدەیان بۆ بردیو لەبەهەشتێی نیشتەجێ کردی، پاشان بەهۆی گوناحەکانتەوە خەڵك بۆ زەوی دابەزین؟ ئادەم گوتی: تۆ ئەو موسایەی کە خودا بەپەیام و گوتەی خۆی هەڵیبژاردیو تۆی کردە پێغەمبەرو تەختەکانی پێدای کە ڕونکردنەوەی هەموشتێکی تێدابو و، لەخۆی نزیك کردیەوە تا بتوانی قسەی لەگەڵدا بکەی، باشە بەچەند ساڵ بەرلەوەی ئافەریدە بم تەورات نوسراوە؟ موسا گوتی: بەچل ساڵ. ئادەم گوتی: دیتت

**نوسرابێ: ئادەم سەرپێچی لەفەرمانی خوا کردو بەهەڵەدا چو؟ گوتی: بەڵێ. گوتی: باشە تۆ بۆچی بەکردەوەیەك سەرزەنشتم دەکەی کە خودا بەر لە چل ساڵی بەدیهێنانم نوسیویەتی؟! پێغەمبەرﷺ فەرموی: بەڵگەکەی ئادەم زاڵ بو و قسەی موسای بڕی)).[1]**

**ئەم فەرمودەیە هیچ بەڵگەو پاساوێکی بۆ ئەوانە تێدا نیە کە قەدەری خوا دەکەنە هۆی کارە دزێو ناپەسەندەکان، چونکە ئادەم ﷺ پاساوی گوناحی بەقەزاوقەدەر نەداوە، موساش ﷺ سەرکۆنەی ئادەمی باوکی نەکردوەو گازاندەی لەو گوناحە لێنەکردوە کە تۆبەی لێکردوەو خوداش تۆبەی لێگیراکردوەو ڕێنوێنی کردوەو کردویەتی بەپێغەمبەر. بەڵکو سەرکۆنەو گازاندەکە لەوەدا بوە کە دەرچونی ئادەم و نەوەکانی لەبەهەشتدا کارەسات و تەنگانەیەکی گەورە و ناخۆش بوە.**

**ئادەم لەسەر موسیبەتەکە قەدەری بەبیانو هێناوەتەوە نەك لەسەر گوناحەکەی. چونکە قەدەر لەسەر موسیبەتان پاساوی پێ دەدرێتەوە نەك لەسەر نەنگیو گوناحان.[2]**

**مرۆڤ لەسەری پێویستە لەموسیبەتەکاندا خۆی تەسلیمی قەدەر بکات: ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ: ئەوانەی ئەگەر توشی موسیبەتێك ببن دەڵێن ئێمە هەر ئی خوداین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە﴾.[3]**

**بەڵام گوناحبارەکان نابێ پاساوکاری بەقەدەرەوە بکەن، بەڵکو لەسەریان واجبە تۆبە لەگوناحەکانیان بکەن و داوای لێخۆشبون بکەن**

---

١ رواه مسلم: (٤/٢٠٤٣) ورقم الحديث(٢٦٥٢) حديث صحيح روته كتب الصحاح والسنن وللحديث عند مسلم عدة روايات، وقد رواه البخاري أيضا في موضع من كتابه؛ ورواه ابوداود والترمذي في سننيهما. انظر روايات الحديث في جامع الأصول: (١٠/١٢٤)

٢ شرح الطحاوية:ل١٥٤ شێخولئیسلام هەمان وەڵامی داوەتەوە، تەماشای شفاء العليل ل٣٥ بکە.

٣ البقرة: ١٥٦.

﴿فاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ: ئارام بگرە بەڵێنی خودا راستە و دێتەجێ، داوای لێبوردن لەخوا بکە بۆ گوناحەکانت ﴾.[1]

لەم ئایەتەدا خودا رێنمونیمان دەکات لەموسیبەتان ئارام بگرین، لەگوناحانیش تۆبەو لێبوردن لەخوا بخوازین.

خوداش کە لەم ئایەتەدا: ﴿ رَبِّ بِمَا أَغْوَيْتَنِي: ئیبلیس گوتی؛خودایە لەبەر ئەوەی تۆ منت گومرا کردوە ﴾.[2] سەرکۆنەی ئیبلیسی کردوە لەبەر ئەوە نیە بڕوای بەقەدەر هێناوە بەڵکو لەبەر ئەوەیە قەدەری خوای کردۆتە پاساو.

ئیبنولقەیم بەجۆرێکی‌تر وەڵامی ئاڵۆزیە(اشکال)کەی ئەوانەی داوەتەوە کە لەمەڕ فەرمودەی ئادەم و موسا توشی بون و دەڵێ: (پاساو دانەوەی گوناحان بەقەدەر لەشوێنێکدا زەرەری هەیەو لەشوێنێکی‌تردا قازانج؛ ئەگەر لەدوای گوناحەکە قەدەری پێ بکرێتە بیانو و تۆبەی لێبکات و نەگەڕێتەوە سەری وەکو ئادەم بکات ئەوا سودی هەیە، ئەو کاتی ئەگەر یادی قەدەر بەو جۆرە دەکات یادی ناو سیفەتەکانی خوا دەکات، کە دەبێتە مایەی سود وەرگرتنی خۆی‌و گوێگرانی. چونکە ئەو کاتە فەرمان و بەرهەڵستیەکانی خوا پوچ ناکاتەوەو شەرعی خوای پێ بەتاڵ ناکات، بەڵکو لەسۆنگەی یەکخواناسیی‌و بێهێزو دەسەڵاتی خۆیەوە یادی حەقێك دەکاتەوە.

گوتەکەی ئادەم کە بەموسای گوت: ئایە لەکردەوەیەك سەرزەنشتم دەکەی بەر لە بەدیهێنانم لەسەرم نوسرابو بیکەم؟! ئەم شتە رون دەکاتەوە جا مرۆڤ ئەگەر گوناحێکی کردو پاشان تۆبەی لێکردو ئیشەکە بڕاوە وەك بڵێی هەر روی نەدابێ ئەوکات ئەگەر یەکێك سەرکۆنەشی کرد، شتێکی باشە ئەگەر بڵێ ئەوە قەدەری خوا بو، بەرلەوەی بەدیبهێنرێم لەسەرم نوسرابو، ئیدی ئەوکات حەقی بەقەدەر وەلا نەناوەو نەشی کردۆتە پاساو و بیانوی کارە بێ‌شەرعیەکانی.

بەڵام ئەو شوێنەی ئەگەر قەدەری پێ‌بکرێتە پاساو زەرەرمەند دەبێت ئەوەیە

---

[1] غافر: ٥٥

[2] الحجر ٣٩

ئەگەر لەحاڵەتی ئایندەدا گوناحێك بكات یان واجبێك نەكات و یەكێكیش گازاندەی لێبكات، بەڵام ئەو قەدەر بكاتە بیانوی گوناحەكەیو لەگوناحەكەشی بەردەوام بێت، ئەوا لەو كاتەدا هەقی پێ پوكەڵ دەكات و كاری ناهەقی پێ دەكات، هەروەكو ئەوانەی كە لەسەر هاوبەشپەرستیو ناخوداپەرستیەكەیان بەردەوام دەبن.)[1]

## ئایا واجبە بەقەدەری خوا رازی بیت؟

هەندێك دەڵێن: ئەگەر گوناحەكانیش بەگوێرەی قەدەری خوا بن، چۆن دەكرێ رقمان لەقەدەری خوا بێتەوەو پێمان ناخۆش بێت؟

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: (نە لە قورئان و نەلەسوننەتدا ئایەت و فەرمودەیەك نیە فەرمان بەبەندە بكات بە تەواوی قەدەری خوا بەچاك و خراپیەوە رازی بێت، بەڵام لەسەر خەڵك واجبە بەفەرمانی خوا رازی بێت و كەس لەفەرمانی خوا تورە نەبێ.

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: سوێند بەخوای پەروەردگارت كەسیان بڕوایان نابێ تا تۆ نەكەنە دادوەری نێوان خۆیان و كە فەرمانیشیان لەنێوان دەدەی دەبێ پێی رازی بن و لەدڵدا پێی پەست نەبن و بەتەواوی بۆی ملكەچ بن ﴾.[2]

پێویستە مرۆڤ بەهەمو قەدەرەكانی خوا رازی بێو تەنها گوناحەكان نەبن، وەك هەژاریو نەخۆشیو زەبونیو ئازاری خەڵك، چونكە ئارامگرتن لەسەر موسیبەتان واجبە، بەڵام پێخۆشنود بون شتێكی مەشروعە، جا ئایا واجبە یان موستەحەببە؟

ئەوا یارانی ئیمام ئەحمەدو كەسانی تریش دو گوتەیان لەم بارەوە هەیە؛

---

١ شفاء العليل: ل٣٥.  ٢ النساء ٦٥

راسترەکەیان ئەوەیە کە موستەحەببەو واجب نیە.)[1]

**شەشەم: پێیان وایە ئەرکبارکردنی بەندەکان بەغەیری ئەوەی کردویانە لەخانەی ئەرکبارکردنی لەتوانا بەدەرەکان دایە:**

**خاوەنی ئەم بۆچونانە پێیان وایە ئەوانەی گوناحکارن نەیاندەتوانی غەیری گوناحەکە بکەن و ئەگەر ئەرکێکی تریان لێبخوازرابوایە لەو جۆرە دەبو کە لەتوانایان دانەبێ، دیارە کە شەریعەتیش ئەم جۆرە ئەرکداریەی وەلاناوەو نەرێی لێکردوە، خوا دەفەرموێ:**

﴿ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا: **خودا ئەرکی لەتوانا بەدەر بەسەرکەسدا ناسەپێنێ** ﴾.[2]

﴿ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا: **خودا ئەرک ناخاتە سەرکەس، مەگەر لەوەندی پێداوە**﴾.[3]

**ئەو ئایەتانەشیان کردۆتە بیانو:**

﴿ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَنْ ذِكْرِي وَكَانُوا لاَ يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا: **ئەوانەی کە چاویان لەیادی من قوچاو بو، نەشیان دەتوانی ببیستن** ﴾.[4]

﴿ يُضَاعَفُ لَهُمْ الْعَذَابُ مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ: **بێبڕواکان سزاکانیان چەندانە دەبێ، نەیاندەتوانی هەق ببیستن و ببینن** ﴾.[5]

﴿ وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ: **لەمپەرێکمان لە پێشیانەوە داناوەو لەمپەرێك لە پشتیانەوە؛ تارماییشمان هاویشتە سەر گلێنەیان کە نابینن** ﴾.[6]

**دەڵێن ئەم ئایەتانە بەراشکاوی ئەوە رادەگەیەنن کە نەیاندەتوانی غەیری ئەم کردەوانە بکەن.**

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/١٩٠)
[2] البقرة ٢٨٦
[3] الطلاق ٧
[4] الكهف ١٠١
[5] هود ٢٠
[6] يس ٩

بەلآم ئەوانە ئایەتەکانی خودایان بەیەکتری داداوە، چونکە پێیان وایە لەگەڵ یەکدا ناسازن، بەلآم دور لەروی قورئان، قورئان شتی وای تێدا نیە.

وەلآمی ئەو گێلەوەژەیە(شغب)ی کردویانە ئەوەیە: (ئەو لەتوانادا بونەی ئەوان لەئایەتەکاندا بەبەڵگەی دێننەوە، ئەو لەتوانادابونە مەرجدارەی فەرمان و بەرهەڵستیەکان ناگرێتەوە، کە ئەگەر ئەوی لەگەڵدا نەبێ فەرمان و بەرهەڵستی‌و هەڕەشەو بەڵێن و ستایش و سەرکۆنەو سزاو پاداشت بەتاڵ دەبنەوە، ئاشکراشە بەندەکان فەرمان پێکراو و بەرهەڵستی لێکراو و بەڵێن پێدراو و هەڕەشە لێکراون، کەواتە ئەو لەتوانادا هەبونەی نەرێی لێکراوە؛ ئەو مەرجدارە نیە کە لە فەرمان و بەرهەڵستیدا هەیە).[٣]

ئەو لەتوانادا هەبونە نەفیکراوەی ئەوان لەئایەتەکاندا بەڵگەخوازیان پێکردوە لەبەر ئەوە نیە کردەوەکە مەحاڵ بێ یان لەبەریدا دەستەوسان بن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە تا وازی لێبێنن و بەهاودژەکەی خەریك بن، بۆنمونە وەکو ئەو بێبڕوایەی کە خودا فەرمانی بڕواهێنانی لێدەکات، خۆ ئەم داوایە مەحاڵ نیە یان بێبڕواکە لەبەریدا دەستەوستان نیە، ئەم لەتوانادا نەبونە وەکو ئەو کەسەیە کە لەبەر ئێش و کارو گوزەرانی ژیانەکەی ناتوانێ بەفێربونی زانستەوە خەریك بێ.)[٤]

بەلآم ئەو لەتوانادا هەبونەی کە لەخانەی ئەرکبارێتی دایە وەکو لەم ئایەتانەدا باس کراون.

﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً: خودا حەجی بڕیارداوە بۆ هەرکەسێ کە بۆی بلوێ﴾.[١]

یان کە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً: ئەگەر یەکێك بەندەی نەبو ئازادی

---

١ آل عمران ٩٧

بكات، يا دومانگ لەسەریەك بەرۆژو بێت، پێش ئەوەی بچنە لای یەك، ئەنجا ئەگەر یەكێك نەیتوانی با نانی شەست هەژار بدات ﴾.[1]

پێغەمبەرﷺیش دەفەرموێت: ((صلِّ قائما، فإن لم تستطع فقاعدا، فإن لم تستطع فعلى جنب: بەپێوە نوێژ بكە، ئەگەر نەتتوانی بەدانیشتنەوە، ئەگەر هەر نەتتوانی بەپاڵدانەوە)).

ئاشكرایە خودا فەرمان بەئەركێك ناكات كە بەهۆی بەربەست و ڕێگرێكەوە لەتوانا بەدەربێ، ئەوەی نەتوانێ بەهەڵسانەوە نوێژ بكات ئەركباری ناكات بەپێوە بیكات، نەخۆش ئەركبار ناكات بەڕۆژو بێت، كوێر ئەركبار ناكات جیهاد بكات، چونكە لەتوانایاندا نیە.

زانایانیش كۆدەنگن لەسەر ئەوەی كە ئەگەر بەندەیەك لەراپەڕاندنی واجبێكدا ناتەوانا بو ئەوا واجبەكەی لەسەر لادەچێ، بەنمونە ئەگەر كەسێك پێی بڕدرابێتەوە شوشتن لەسەر پێبڕدراوەكەی نیە، ئەوەی نەتوانێ خۆی بشوات یان بەپێوە نوێژ بكات یان نەتوانێ كڕنوش ببات یان هەرشتێكی‌تر نەتوانێ ئەوا ئەركەكەی لەسەر لادەچێ، لەمەوە دەردەكەوێ ئەو لەتوانادا نەبونەی ئەوان لەئایەتەكاندا بەبەڵگەی دێننەوە ئەو بەرجدارە نیە كە لەفەرمان و بەرهەڵستیەكاندا هەیەو موسڵمانان لەسەری یەكدەنگن، بەڵام ئەو لەتوانادابونەی لەخانەی فەرمان و بەرهەڵستیەكاندا هەیەو لەو ئایەتانەی هێنامانەوە دەردەكەوێ؛ ئەوا خودا هیچ بەندەیەكی ناتەواوی پێ ئەركبار نەكردوە.[2]

### حەفتەم: قسەكانیان وای لێدێ دو شتی ناكۆك وەكو یەك لێبكەن:

ئەم بۆچونە وای لە خاوەن بۆچونەكان كردوە خراپكارو چاككار، باش و خراپ، دۆزەخی‌و بەهەشتیەكان وەكو یەك تەماشا بكەن و پێیان وابێ

1 المجادلة ٤

2 بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوي شيخ الاسلام (٨/١٣٠)

**جیاوازیان نەبێ، کەچی خودا خۆی جیای کردونەتەوەو دەفەرموێ:**

﴿ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ: **ئاخۆ ئێمە ئەوانەی خاوەن بڕوان و ئاکارچاکن، هەروەك ئەمانە دادەنێین کە لەم زەویەدا بەدفەڕن؟! یاخۆ ئێمە خۆپاریزان وەك گوناهباران دەژمێرین؟!** ﴾[1]

﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ: **ئاخۆ ئەوانەی بەدکارن وادەزانن ئێمە لە ژین و مەرگیاندا وەك ئەوانەیان دادەنێین کە خاوەن بڕواو ئاکاری چاکن؟!** ﴾.[2]

﴿ أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ، مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ: **ئاخۆ بڕواداران وەکو بەدکاران دادەنێین؟! ئێوە چیتانە چۆن بڕیاری وا دەدەن؟!** ﴾.[3]

---

١ ص ٢٨،٢٨ ٢ الجاثية ٢١ ٣ القلم ٣٥-٣٦

# جێباسی سێیەم

## ڕاڕەوەی یارانی ڕێبازو کۆمەڵ لەبارەی قەزاوقەدەرەوە

لەباسەکانی پێشودا باسی ڕاڕەو(مذهب)ی گومڕاکانمان کرد، حەز دەکەم ئێستاش باسی ڕاڕەوی یارانی ڕێبازو کۆمەڵ (مذهب أهل السنة والجماعة) بکەم.

گەلێك لەزانایانی بەتوانا ڕاڕەوەکەیانی نوسیون و لەبارەیەوە دواون، ئێمەش لێرەدا نوسراوی سێ لەو زانایانە دەخەینە ڕو:

### خوازگەی یەکەم

### ئیبنوتەیمیە ڕاڕەوەکەیان بە پوختی دەخاتە ڕو

شێخلئیسلام ئیبنوتەیمیە ڕاڕەوەکەیان بەپوختەیی دەخاتە ڕو و دەڵێ: (بۆچونی یارانی ڕێبازو کۆمەڵ لەم بارەوە بەپێی قورئان و سوننەتە، کۆچەرو پشتیوانان و شوێنکەوتوە ڕاستەکانیش ئەم بۆچونەیان هەبوەو پێیان وابوە کەخودا بەدیهێنەرو خاوەنی هەمو شتێکە، هەمو شتێك کردەوەی بەندەو غەیری بەندەش.

خودا چی ویستبێ بوە، ئەوەی نەیویستوە نەبوە، هیچ شتێکیش بەویست و توانستی خوا نەبێ نابێ، ئەو شتەی بیەوێ لێی عاسێ نابێ، توانای بەسەر هەمو شتێکدا دەشکێو هەر شتێکی بوێ توانای هەیە بیهێنێتە دی.

خودا ئاگادارە بەو شتانەی بونە و دەبن، ئەوانەش کەهێشتا نەبونە دەیزانی ئەگەر ببان چۆن دەبون، زانستەکەی خودا کردەوەی بەندەو جگە لەبەندەش دەگرێتەوە.

خودا بەر لەوەی بونەوەر بەدیبهێنێ قەدەری بۆ بڕیار داون، قەدەری ئەجەل و بژێویو کردەوەکان و هەموشی نوسیون، نوسیویەتی سەرەنجامیان

بەدبەختی دەبێ یان بەختەوەری.

یارانی ڕێبازو کۆمەڵ بڕوایان بەوە هەیە کە خودا هەمو شتێکی بەدیهێناوەو توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە، ویستی بە هەمو بوێکدا جێبەجێ بوە، بەر لەوەی شتەکان ببن زانستی پێیان هەبوەو، قەدەری بۆ بڕیار داون و پێش ئەوەی ببن نوسیونی.)[1]

(پێشینانی نەتەوەو پێشەواکان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەندەکان بەرئەرکی فەرمان و بەرهەڵستیەکانن، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە بڕوایان بە بەڵێن و هەڕەشەکانی نێو قورئان و سوننەت هەیە. هەروەها یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی واجبێك نەکات یان حەرامێك بکات بڕوبیانوی لەسەر خوا نیە، بەڵکو خوا بڕوبیانوی لەسەر بەندەکانی هەیە).[2]

(پێشینان و پێشەوایانی نەتەوە وێڕای بڕوابونیان بە قەزاوقەدەر لەوەدا یەکدەنگن کە خودا بەدیهێنەری تەواوی شتانە، ئەوەی ویستبێتی بوەو ئەوەی نەیویستوە نەبوە، خودا بەویستی خۆیەتی کێی بوێ ڕێنوێنی دەکات و کێشی بوێ گومڕای دەکات. لەگەڵ ئەوانەشدا بڕوایان وایە بەندەش ویست و توانستیان هەیە، بەو ویست و توانستە ئەو شتانە دەکەن کە خودا بۆی تەقدیر کردون، لەهەمان کاتیشدا دەڵێن؛ بەندەکان ویستیان نابێ مەگەر خودا ویستی لەسەر بێ.)[3]

## خوازگەی دوەم

### بیروباوەڕی ئیمام ئەبوبەکر موحەممەدولحوسێنی ئاجوری لەبارەی قەدەرەوە

دەڵێ: (بۆچونمان لەبارەی قەدەر ئەوەیە کە دەڵێین: خودا بەهەشت و دۆزەخی بەدیهێناوە، بۆ هەر یەکێکیاننیش خەڵکانێکی هەیە، سوێندی بەعیززەتی خۆشی خواردوە دۆزەخ بەجنۆکەو مرۆڤ پڕ بکاتەوە.

١ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٤٤٩)
٢ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٤٥٢)
٣ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/٤٥٩)

پاشـان ئـادەمی‌ﷺ بەدیـهێناوەو هـەمو ئـەو نەوانــەش کـە تـا رۆژی قیامـەت بــەدی‌دەهێنێ لەپشــتیەوە دەریــهێناون و پاشــان کردونــی بــەدو کۆمــەڵ، کۆمەڵێکیان بۆ بەهەشت و کۆمەڵەکەی تریش بۆ دۆزەخ.

ئیبلیسی بەدیهێناو فەرمانی پێ‌کرد سوژدە بۆ ئادەم ببات، خـودا دەیزانـی سوژدە نابات و لەو قەدەرە لانادات کە خودا لەدێرینەوە زانیویێتی.

فەرمانــەکانی خــوا لەمپــەری نیــە، چــی لەبەدیــهێنراوان بــوێ دەیکــات، قەزاوقەدەری خودا دادگەرە.

ئادەم و حەوای بەدیهێنا (سلاویان لێبێ) بۆ سەرزەوی بەدیهێنان، لەبەهەشتێ نیشتەجێی کـردن، فـەرمانی پـێ‌کردن بەئارەزوی خۆیـان چ دەخـۆن بـا بخـۆن، تەنها یەك دار نەبێ نابێ توخنی بکـەون، قـەدەری خـوا ئـەوەی بڕاندبۆوە بـەری دارەکە دەخۆن و سـەرپێچی دەکەن، خودا لەرواڵەتدا بەرهەڵستی لێکردون، بەلام لــەناوەوەدا لەزانســتی خــۆی تــەقدیری کــردوە لەبــەری درەختەکــە دەخــۆن ﴿ لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ: چـی ئـەو بیکا ناشـێ پرسیاری لێبکرێ، و ئــەوانن کــە بەرپرســیارن ﴾[1]، هــەردەبو بیانخواردبــا کــەهۆی ســەرپێچی‌و دەرچونیــان بــو لەبەهەشــت، چونکــە بــۆ زەوی بەدیــهێنرابون و، دەیزانــی و تــەقدیری کردبـو لـەدوای سـەرپێچییەکە لێیـان خـۆش دەبـێ. هـەمو ئەوانـەی لەزانستی پێشینەدا هەبو، قەت شتێك رونـادات ئەگـەر لەقـەدەری خـوادا نـەبێ، پێشتریش دەبێ زانیاری خوا گرتبیەوە.

بونەوەری وەك چۆنـی ویسـتوەو بۆچـی ویسـتوە بەدیـهێناوە، هـەمو کەسـێ بەرلــەوەی بێنــە دنیــاوە کــە هێشــتا هــەر لــەزگی دایکیــاندان دیــار کــراوە کــێ بەدبەختــەو کــێ بەختــەوەرە، تەمــەنیان چــەندە نوســراوە، بژێویــان نوســراوە، کردەوەکانیـان نوسـراوە، پاشـان هێناوینیـە دنیـاوە، هـەمو مرۆڤێکیـش هـەوڵ‌و تەقەللا بۆ ئەوە دەدات کە بۆی نوسراوە.

---

[1] الأنبياء ٢٣

پاشان پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوەو سروشی بۆ ناردون و فەرمانی پێکردون پەیامەکانی خوا بەخەڵك رابگەیەنن، ئەوانیش پەیامەکانی خوایان راگەیاندو ئامۆژگاری گەلەکەیان کردو ئەوجا ئەوەی لە قەدەری خودا بڕواداریێتی بۆ نوسراوە بڕوای هێناوە، ئەو کەسەش بێبڕوایی بۆ نوسراوە بێبڕوا بون.

خودا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ: هەر ئەویشە کە ئێوەی وەدیهێناوە، سا هێندێکتان بڕوای پێنەهێناوەو هێندێکیشتان بەبڕوایە. هەر کارێکیش دەیکەن خوا دەیبینێ﴾[1].

هەندێ بەندەی خۆشویستوە، بۆیە دڵ و سینەیانی بۆ ئیسلام و بڕوا فرەوان کردوەو بوینە بڕوادار، لەهەندێکیشیان رق و تورەیی هەبوەو مۆری لە دڵ و چاو گوێ داون بۆیە قەت بڕوا ناهێنن، کێی بوێ رێنوێنی دەکات و کێشی بوێ گومڕای دەکات: ﴿ لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾.

بەدیهێنراوان هەموی هی ئەون، چی لێیان بوێ دەیکات، ستەمیان لێناکات، خودا لەوە بەرزترە ستەم بکات، ئەو کەسە ستەم دەکات شتێك ببات و هی خۆی نەبێ، بەلاّم چی لە ئەرزو ئاسماندا هەیە هەموی موڵکی خودایە، دنیاو ئاخیرەت هی ویە، پاك و پیرۆزی بۆ ئەوە.

خودا فەرمانبەرداریی بەندەکانی خۆش دەوێ و فەرمانی پێکردوە، ئەوانەی فەرمانبەرداری خوا دەکەن بەیارمەتی خوایە، هەروەها بەرهەڵستی لەخراپە کردوە، ویستی لەسەر بوە، بەلاّم خۆشی نەویستوەو فەرمانی پێ نەکردوە، خودا لەو بەرزترە فەرمان بەخراپە بکات، یان خۆشی بوێ، لەوەش بەرزو شکۆدارترە بەبێ ویستی وی شتێك لەناو موڵکی ویدا روبدات، یان شتێك زانیاری پێ نەبێ ببێ، لەپێش و پاش ئەوەی بەدیهێنراوان بەدیبهێنێ زانیویێتی چ دەکەن و، قەزاوقەدەری بڕواندۆتەوە.

قەڵەم بەفەرمانی خوا هەرچی دەبێ لەچاك و خراپ لەتەختی پارێزراو(لوح

---

[1] التغابن ٢

المحفوظ)دا نوسیویەتی، خـوا ستایشـی ئـەو کەسـانە دەکـات کەفەرمانبـەری دەکـەن، کردەوەکـان دەداتـە پـاڵ بـەندەکان و پاشـانیش بـەڵێنی پاداشـتیان دەداتێ، ئەگەر خودا یاریدەیـان نەدات ئەو کردەوانەیان پێنەدەکرا کە دەبنە مایەی پاداشت وەرگرتن:﴿ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّـهُ ذُو الْفَضْـلِ الْعَظِيمِ: ئەم چاکەیە لە خواوەیەو دەربارەی کەسێکی دەکا کە بۆ خۆی مەیلی لەسەر بێ، چاکەی خوا زۆر گەورەیـە﴾[1] هـەروەها سەرزەنشتی ئەو کەسانەی کـردوە کـە سـەرپێچی لێدەکـەن و هەڕەشـەی لێکـردون، کردەوەکـانیش ئیزافـە دەکاتـە سـەر بکـەرەکان، هەموشـی بـەگوێرەی راددەو قـەدەری خـوا بڕاوەتـەوە، کێی بوێ ڕێنوێنی دەکات و کێشی بوێ گومڕای دەکات.

موحەممەی کوڕی حوسێن (رەحمەتی خوای لێبێ) دەڵێ: لـەبارەی قـەدەرەوە ئەمەیە بۆچونمان.)[2]

## خوازگەی سێیەم

### بیروباوەڕی طەحاوی لەبارەی قەدەری خواوە

طەحاوی (رەحمەتی خوای لێبێ) لـەبارەی قەدەرەوە دەڵێ: ((خـودا بونـەوەری بەزانسـتی خـۆی بەدیـهێناوە، قـەدەری بـۆ ئـەندازە کێشـاون و ئەجـەلی بـۆ دیارکردون، بەر لـەوەی بـەدیان بهێنێ هیچ شتێکی لێ بزر نـەبوەو زانیوێتـی چ دەکەن، فەرمانی پێکردون ملکەچی بن، بەرهەڵستی لێکردون سەرپێچی بکەن، هەمو شتێك بەرێوشوێنی تەقدیرو ویستی خوا بـەڕێوە دەچێ، ویستەکەشـی دێتەدی، بـەندەکان هیچ ویستێکیان نیـە ئەگـەر ویسـتی خـوای لەگـەڵ نـەبێ، ئەوەی خوا ویستویەتی بوە، ئەوەی نەشیویستوە نەبوە.

لەچاکـەی خۆیـەتی کێـی بـوێ ڕێنوێنـی بکـات و لـەگوناح و سـەرپێچیان بیپارێزێ و بەدادی خۆشیەتی کێی بوێت گومڕاو ریسواو گرفتاری بکات.

---

١ الحديد ٢١    ٢ الشريعة للآجرّي ١٥٠-١٥٢

هەر هەمویان لەنێو ویستی خوا دان، چ وەبەر چاکەی بکەون، چ وەبەر دادگەریی.

خودا لەوە بەرزترە هاودژو هاوبەشی هەبێ، قەدەری خوا گەڕانەوەو بەرپەرچی نیە، کەس نیە دەسکاری بڕیارەکانی خوا بکات، کەس نیە بەسەر فەرمانەکانی خوا زاڵ بێت.

بڕوامان بەهەمو ئەوانە هەیەو دڵنیاین هەرهەموی لەلای خواوەیە.))[1]

((خودا هەر لەدێرینەوە زانیوێتی ژمارەی بەهەشتیان و ژمارەی دۆزەخیان چەندە، نە لەو ژمارەیە کەمتر دەبێتەوەو نەزیاتر.

هەروەها زانیوێتی چ جۆرە کردەوەیەکیش ئەنجام دەدەن، هەمو دروستکراوێکیش ئەوەی بۆ ئاسان کراوە کە بۆی بەدیهێنراوە، کردەوەکانی کۆتاییش مەرجە، بەختەوەریش ئەو کەسەیە بەقەزاوقەدەری خوا بەختەوەر بێ، بەدبەختیش ئەوکەسەیە بەقەزاوقەدەری خوا بەدبەخت بێ.

قەزاوقەدەر لەبنەڕەتدا نهێنیەکی خودایە، نە فریشتەی نزیک و نەپێغەمبەرانیش چاویان بەو نهێنیە نەکەوتوە، تێدا قوڵبونەوەشی سەردەکێشێ بۆ ریسوایی، هۆکاری بێبەشبونە، پلەی یاخی بونە، زۆر وریابە هێندە بەبیرکردنەوەو تێرامان و ئەرێو نەرێیان دامەچو، چونکە خودا زانستی قەدەری لەخەڵك شاردۆتەوەو مەبەستەکانی لێ پەردەپۆش کردون ﴿لاَ يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾

ئەوەی بپرسێ و بڵێ: بۆ ئەمەی کرد؟ حوکمی قورئانی رەت کردۆتەوە، ئەوکەسەی حوکمی قورئانیش رەتکاتەوە دەچێتە ریزی بێبڕوایان.

ئەمانە شتانێکن ئەوانەی دڵیان روناك بۆتەوەو دۆستی خودان ئەوەندەیان بۆ بەسە. ئەمەش پلەی ئەو کەسانەیە کەلەزانستدا رەگیان داکوتاوە، چونکە دو چەشنە زانست هەیە؛ زانستێکی دیار لەبارەی بونەوەر، زانستێکی نادیاریش

---

١ العقيدة الطحاوية، شرح وتعليق الشيخ ناصرالدين الألباني: ص٢١

لەبارەی بونەوەرەوە. جا ئینکاری کردنی زانستی دیار کوفرە، هەروەها بانگەشەکردنی زانستی نادیاریش کوفرە، بڕوا ئەوکاتە دێتە دیو دادەمەزرێ کە زانستی دیار قبوڵ بکرێو واز لە زانستی نادیاریش بهێنرێت.

دەبێ بڕوامان بەتەختی پارێزراو(لوح المحفوظ) و پێنوس و بەهەمو ئەو شتانەش هەبێ کە تێیدا تەقدیر کراون، ئەگەر هەمو بەدیهێنراوان کۆببنەوەو بیانەوێ قەدەرێکی بڕیاردراو بگۆڕن و نەهێڵن ببێ؛ناتوانن و هەر دەبێ، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر هەمو بەدیهێنراوان کۆببنەوەو بیانەوێ قەدەرێکی بڕیارنەدراو بگۆڕن و تەقەللای بۆ بدەن ببێ؛ هەر نابێ. نەخشی قەڵەم تا ڕۆژی قیامەت هەرچی دەبێ نوسیویەتیو وشك بۆتەوە، ئەگەر مرۆڤ شتێکی لێبێ نەدەبو وای لێ نەهاتایە، ئەگەر شتێکی لێنەیەت نەدەبو وای لێبهاتبا.

لەسەر بەندەکان پێویستە بزانن کە زانینی خودا وەپێش هەمو شتێك کەوتوەو، هەمو بونەوەری زۆر بەپوختەیی تەقدیر کردوە، کەس ناتوانێ هەڵیبوەشێنێتەوە یان دەسکاری بکات یان لێی لابدات یان بیگۆڕێ، هەرچی لە ئەرزو ئاسمانەکانی بەدیهێنابێ لەو ئەندازەیەی تەقدیری کردوە کەم و زیادیان نەکردوە. ئەوانە لەبیروباوەڕدا بنەڕەتن و سەرچاوەی مەعریفەن و ئیعتراف کردنە بە یەکخواپەرستیو پەروەردگارێتی خودا وەك پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا: هەموو شتی لەرادەی خۆی دروست کردو ئەندازەی گرت ﴾[1]، ﴿ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا: خوا هەرچی فەرمان بدا بێ زیاد و کەم دەبێ بکرێ ﴾.[2]

ئەوجا سزاو بەدبەختی بۆ ئەوانەی کە رکەبەرایەتی قەزاوقەدەر دەکەن و بەدڵی نەخۆشەوە تێی دەڕوانن، کە بەخەیاڵ و وەهمی خۆیان وادەزانن شاراوەیان دۆزیوەتەوە تا لەئەنجامدا دەبنە گوناحبارێکی درۆزن.[3]

---

١ الفرقان ٢ ٢ الاحزاب ٣٨ ٣ العقيدة الطحاوية: ٣١

# بەندی شەشەم

## هۆیەکانی گومڕابون لەقەدەردا

هۆی گومڕابونی قەدەریە نەرێویژەکان و قەدەریە جەبریەکان ئەوەیە کە هەر کۆمەڵێکیان بەشێکی قەزاوقەدەریان دیتوەو لەئاست بەشەکەیتردا کوێر بون، وەکو کەسێکی یەکچاو وابون کە تەنها لایەکی شتان دەبینێ.

ئەو قەدەریە نەرێویژانەی کەنەرێیان لەقەدەری خوا دەکرد دەیانگوت: خودا نایەوێ بێبڕوایی‌و گوناح و سەرپێچی روبدات و نە خۆشیشی دەوێن و نە پێشیان رازیە، کەواتە چۆن دەبێ بڵێین خودا کردەوەی بەندەکانی بەدیهێناوە کە بێبڕوایی‌و گوناح و سەرپێچی تێدایە.

قەدەریە جەبریەکانش بڕوایان بەوە هێنابو کە خودا بەدیهێنەری هەمو شتێکەو پێیان وابو هەر شتێکی خوا بەدیهێنابێ و هێناویەتیە دی خۆشی دەوێ‌و پێی رازیە.

بەڵام یارانی رێبازو کۆمەڵ(أهل السنة والجماعة) هەمو هەقیقەتەکەیان دیت و بڕوایان بەو حەقە هێنا کە لەلای هەردو کۆمەڵدا هەبو، ئەو ناهەقەشیان رەت کردەوەو کە هەردو کۆمەڵ تێوەی گلابون.

ئەوان دەڵێن: (خودای گەورە ئەگەرچی لەقەدەردا ویستویەتی گوناح هەبێ؛ بەڵام خۆشی نەویستوەو پێی رازی نیەو فەرمانی پێناکات، بەڵکو رقی لێ دەبێتەوەو نەهیشی لێ دەکات.)

قسەی سەرجەم زانایانی پێشین بەم جۆرەیە کە دەڵێن: ((ئەوەی خوا ویستی هاتە دی، ئەوەی نەیویست نەهاتە دی، هەر لەبەر ئەوەیە فیقهزانان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك سوێند بخوات و بڵێ بەو خودایە ان

شاء الله وادەکەم، ئەگەر نەیکات سوێندەکەی ناکەوێ، ئەگەرچی کارەکە واجب یان سوننەتیش بێ، بەڵام ئەگەر بۆ کارێکی واجب یان سوننەت بڵێ ئەگەر خوا حەز بکات ئەوا سوێندەکەی دەکەوێت)).

**لێکۆڵەرەوانی ئەهلی سوننەت دەڵێن لەقورئاندا دو جۆر ئیرادە هاتوە:**

١- ئیرادەی خەڵقی قەدەری

٢-ئیرادەی شەرعی دینی

ئیرادە شەرعیەکە خۆشویستن و پێ‌رازیبونی خوا دەگرێتەوە، بەڵام ئیرادە خەلقیەکە ویستی سەرتاپاگیری خودا بۆ سەرجەم بونەوەران دەگرێتەوە.

خودا لەم ئایەتانەدا باسی ئیرادەی شەرعی دەکات:

﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ : خودا ئاسانی بۆتان دەوێ، سەختی بۆ ئێوە ناوێت.﴾[1].

﴿ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ : خودا نایەوێت لەدیندا توشی سەختیتان بکات، بەڵکو دەیەوێ پاکتان بکاتەوەو بەخششی خۆی بەتەواوی بدات ﴾[2].

﴿ يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ، وَاللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَنْ تَمِيلُوا مَيْلاً عَظِيمًا، يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا:

خودا دەیەوێ هەمو شتێکتان بۆ رون بکاتەوەو رێنوێنیتان بکات بۆ ئەو یاساو بەرنامانەی پێش خۆتان، وە تەوبەتان لێ‌وەربگرێت، خودا زاناو دانایە، خودا دەیەوێ تەوبەتان لێ قبوڵ بکات، کەچی ئەوانەی وەدوای ئارەزو و شەهەوات کەوتون دەیانەوێ لەرێ لاتان بدەن، خوا دەیەوێ کاری ئێوە ئاسان بکات

---

١ البقرة ١٨٥ ٢ المائدة ٦

**چونکە ئادەمیزاد بە لاوازی بەدیهێنراوە (کەم خۆی رادەگرێت) ﴾[1].**

﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا: **بەڵکو خوا دەیەوێ پیسی و چەپەڵیتان لەسەر لاببا و پاک و خاوێنتان راگرێ﴾.[2]**

**ئەم جۆرە ئیرادەیە مەرج نیە مەبەستی پێ بێتەدی، تەنها ئەگەر جۆرەکەی تری لەگەڵ هاوبەند بێ. ئەم جۆرە ئیرادەیە بەئاشکرا دیارە گوناح و سەرپێچیو گومڕایی و کوفری خۆش ناوێت و فەرمانی پێناکات و پێی رازی نیە، ئەگەرچی ویستی بەدیهێنان و هێنانە ئاراشی لەگەڵدا بوبێ.**

**بەڵکو هەرچی پەیوەندی بەفەرمانە دینیەکانەوە هەبێ خۆشی دەوێت و پێی رازیە، پاداشتی ئەنجامدەرانیشی دەداتەوەو دەیانخاتە بەهەشت، لەدنیاو لەئاخیرەتیشدا سەرکەوتویان دەکات. بەهۆیەوە بەندە دۆست و پارێزکارو کۆمەڵە خواویست و چاکەکارەکانی پێ سەردەخات[3].**

**ئەم چەشنە ئیرادەیە سەرجەم فەرمانبەریەکان دەگرێتەوە، جا روبدات یان نا[4]**

**بەلام ئیرادەی قەدەری گەردونی -ئەو ئیرادەی کە سەرجەم بونەوەران دەگرێتەوە- لەبارەیەوە دەگوترێ؛ ئەوەی خودا ویستی هاتە دی، ئەوەی نەیویست نەهاتە دی. ئەم چەشنە ئیرادەیەش لەم ئایەتانەدا باسی دەفەرمویّ:**

﴿ فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا: **هەر ئامۆژگاریەکتان بکەم بەهرە نادا؛ ئەگەر خوا بڕیار بدا گومڕاتان بکات.﴾[5].**

١ النساء ٢٦-٢٨.

٢ الاحزاب ٣٣.

٣ بگەڕێوە بۆ: شرح الطحاوية: ل١١٦، مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٥٨،١٨٨/٨).

٤ بگەڕێوە بۆ: مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (١٩٨/٨).

٥ الانعام ١٢٥

﴿وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدْتُ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِنْ كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُغْوِيَكُمْ: **من ئامۆژگاریشتان بکەم، ئەگەر خودا بیەوێت گومڕاتان بکات ئامۆژگار نابن.** ﴾[1].

﴿.. وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا اقْتَتَلُوا وَلَكِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ : **ئەگەر خودا بیویستبا بەشەڕ نەدەهاتن، بەڵام خودا چی بوێ دەیکات** ﴾[2].

﴿وَلَوْلاَ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ : **دەبوایە کاتێ چویە ناو باخەکەت بتگوتایە؛ ئەمە نیعمەتێکە خوا داویێتی، هێزو بەرەکەت تەنیا لەلای خواوەیە** ﴾[3].

**ئەم جۆرە ئیرادەیە، ئیرادەیەکی هەموگرەو سەرجەم بونەوەران دەگرێتەوە، تەواوی روداوە گەردونیەکان لەجوغزی ویستی خوادا دەبن، لەمەشدا (بڕوادارو بێبڕوا، چاك و خراپان، دۆزەخیو بەهەشتی، دۆست و دوژمنانی خودا، ئەوانەی گوێڕایەڵی خودا دەکەن و خوایان خۆش دەوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت و خوداو فریشتەکان درودیان بۆ دەنێرن و ئەو سەرپێچیکارانەی خودا رقی لێیان دەبێتەوەو لێیان توڕەیەو نەفرەتیان لێدەکات..) هەمو ئەوانە لەئاست ئەم ئیرادەیەدا وەکو یەکن و ئیرادەکە هەمویان دەگرێتەوە**[4].

**ئەم ئیرادەیە ئەو فەرمانبەریو نافەرمانیانە دەگرێتەوە کە رودەدەن**[5].

**بەدیهێنراوانیش لەئاست هەردو ئیرادەدا دەبنە چوار جۆر:**

**یەکەم:** ئەو بەدیهێنراوانەی هەردو ئیرادەکەی پێوە پەیوەستە، ئەو کردەوە **چاکانە دەگرێتەوە کە رودەدەن، چونکە خودا ئیرادەیەکی دینیو شەرعی**

١ هود ٣٤
٢ البقرة ٢٥٣
٣ الكهف ٣٩
٤ بگەڕێوە بۆ: شرح الطحاوية:ل١١٦، مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/١٩٨، ٥٨).
٥ مجموع فتاوي شيخ الاسلام: (٨/١٩٨).

لەسـەر بـوەو فـەرمانی پێکـردوەو پێـی رازی بـوەو خۆشیویسـتوە، هـەروەها ئیرادەی گەردونیشی لەسەر بـوەو هاتۆتـەدی، ئەگـەر ئـەو ئیرادەیـەی لەگـەڵدا نەبوایە نەدەبو.

دوەم: ئەوانـەی تەنـها ئـیرادەی دینییـان پێـوە پەیوەسـتە، ئەمـەش کـردەوە چاکەکان دەگرێتەوە کەخودا فەرمانی پێکردوەو بێبڕواو بەدکاران سەرپێچیان تێدا کـردوە. ئـەم جۆرە ئیرادەیە تەنها ئیرادە دینیەکەیە، جا بێتەدی یان نـا. خودا هەر خۆشی دەوێت و پێی رازیە.

سـێیەم: ئەوانـەی تەنها ئیرادەی گـەردونیان پێـوە پەیوەستە، ئەمانـەش ئـەو روداوانە دەگرێتەوە کە خودا قەدەرو ویستی لەسەر بوەو فەرمانی پێنـەکردوە، وەکـو موبـاح و گوناحـەکان، خـودا نەفـەرمانی پێکـردوە نـەپێی رازی بـوەو نەخۆشـی ویستوە، چونکـە خـودا فـەرمان بـەکاری نـاڕەوا ناکـات و لـەبێبڕوایی بەندەکان رازی نابێت و ئەگەر ویست و توانست و بەدیهێنانی خودای لەگـەڵدا نەبوایە نەدەهاتە ئاراوە، چونکە ئەوەی خوا ویستی هاتە دی، ئەوەی نەیویست نەهاتە دی.

چوارەم: ئەوانەی نەئیرادەی یەکەم و نەئیرادەی دوەمیان پێوە پەیوەست نیە. ئەو گوناح و موباحانە دەگرێتەوە کە رویان نەداوەو نەهاتونەتە ئاراوە.[1]

جا بەندەی بەختەوەر ئەوکەسەیە کە هـەردو ئیرادەکەی لێ هاتۆتـە دی؛ هـەم ئیرادەی قەدەریی، هەم ئیرادەی تەشریعی، بەڵام بەندەی بەدبەخت ئەوکەسـەیە ئـیرادەی قـەدەری لێ هاتۆتـە دی بـەڵام ئـیرادە شـەرعیەکەی خـوای جێبـەجێ نـەکردوە. یـارانی رێبـازو کۆمـەڵ ئەوانـەی بەتـەواوی لـەدینی خـوا گەیشـتون و ئایەتـەکانی پـەروەردگاریان بـەرەنگاری یـەك نەکردوەتـەوە، زانیویانـە فەرمانەکانی خوا بەگوێرەی ئـەم دو ئیرادەیە بەڕێوە دەچن، هـەر بەندەیەکیش بەم دو چاوە بڕوانێتە کردەوەکـان بـەرچاو رونـەو راسـتەرێی گرتۆتـە بـەر، بـەڵام

---

[1] مجموع فتاوي شيخ الاسلام (١٨٩/٨)

ئەوانەی تەنها تەماشای قەدەر دەکەن یان تەنها تەماشای شەرع دەکەن، چاوێکیان کوێرە، وەکو هاوبەشپەرستانی قورەیشیان لێ دێت کە دەیانگوت:

﴿لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلاَ آبَاؤُنَا وَلاَ حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ: ئەگەر خودا بیویستایە نەخۆمان و نەباو وباپیرانمان هاوبەشپەرست نەدەبوین و ئێمە هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد﴾[1].

﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلاَّ الظَّنَّ وَإِنْ أَنْتُمْ إِلاَّ تَخْرُصُونَ : ئەوی بەر لەوانیش هەبون هەر بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێنا تا ئەو کاتەی کە جەزرەبەی ئێمەیان چەشت، بڵێ: ئەگەر لە زانین شتێك شك دەبەن، بۆمان دەرخەن! بەڵام ئێوە هەر وەشوێن گومان دەکەون و هەر لەخۆوە قسەدەکەن.﴾[2] [3]

---

١ الانعام ١٤٨.

٢ الانعام ١٤٨ ١

٣ بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوي شیخ الاسلام: (١٩٨/٨)

# بەندی حەفتەم

## بەروبومی بڕوابون بەقەدەر

پێشتر رونمان کردەوە کە ئیسلام دورە لەتەمبەڵیو سستی و خاویو زەبونی هەرچەندە ئەم سیفەتە نەخوازراوانە بەدرێژایی رۆژگار بەناوی ئیمان هێنان بەقەدەرەوە روبەرێکی بەر فرەوانی نەتەوەی ئیسلامی داگرتۆتەوە. بێگومان بەرپرسیارێتیەکە لەئەستۆی موسڵمانان دایە چونکە لەبارەی قەدەرەوە لاڕێ بون و بەپوختەیی وەکو خۆی تێی نەگەیشتون.

هەر کەسێکیش لە بیروباوەڕی ئەم قەدەرە وردبێتەوە کە ئیسلام هێناویەتی، ئەوا بۆی دەردەکەوێ جۆرەها بەروبومی پاك و بەرفرەی بەرهەم هێناوە، کە پێشترو ئێستاش هۆکاری چاکسازیی تاك و کۆمەڵ بون.

وا لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێك لەو بەروبومانە بخەینە رو کە لەمیانەی ئەو توێژینەوەیە بۆمان دەرکەوتوە:-

**١- بڕوابون بەقەدەر رێگای رزگاربونە لەهاوبەشپەرستی:**

زۆر لەفەیلەسوفان گوتویانە: خێر لەلایەن (الله)ەوەیەو شەڕیش لەلایەن خوایەکیتر دایەو جگە لەخوا دەیهێنێتەدی ، ئەمەشیان لەبەر ئەوە گوتوە تا خۆیان لەوە قوتار بکەن کە شەڕ نەدەنەوە لای خوا.[1]

ئاگرپەرستەکانیش پێیان وابو (روناکی) بەدیهێنەری خێر بوەو (تاریکیش) بەدیهێنەری شەڕ.

هەروەها ئەوانەی لەم نەتەوەیەدا پێیان وابو خودا کردەوەی بەندەکانی

---

١ شفاء العليل ل١٤

بەدینەهێناوە، یان کردەوەی گومڕاکانی بەدینەهێناوە ئەوا دو خوای تریان بێجگە لە (الله) بۆخوا بڕیارداوە.

تەنها ئەو کەسەش یەکخواپەرستیەکی تەواوی هەیە؛ دان بەوەدابنێ تەنها خودا بەدیهێنەری تەواوی گەردون و بونەوەرە، ئیرادەکەشی بەردەوامە، ئەوەی ویستویێتی بوە. هەر شتێکیش نەیویستبێ نەبوە، بۆیە هەمو ئەوانەی بێبڕوابون بەقەدەر خوایان بەتاك و تەنیا دانەناوەو بەتەواوی نەیانناسیوە. جا بڕوا بون بەقەدەر دوریانی نێوان یەکخواناسی و هاوبەشپەرستیە.

ئەگەر یەکێك بڕوای بەقەدەر هەبێ دان بەوە دادەنێت کەهەرچی لەبونەوەردا هەیەو رویداوەو رودەدات هەر هەموی لەلایەن خوایەکی تاك و تەنهاوەیە، هەر کەسێکیش ئەو بڕوایەی نەبێ ئەوا جگە لەخودا بڕوا بەچەند بەناو خودای تریش دێنێ.

**٢- لە خۆشیو ناخۆشیدا راستەڕێ( استقامة ) دەبێ:**

مرۆڤ لەبەر ئەوەی لاوازیو کەموکورتی تێدایە بۆیە هەمو دەمێ لەسەر راستەڕێ نابێ، خودا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ الإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا، إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا، وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا، إِلاَّ الْمُصَلِّينَ : ئادەمی بە بەرچاو برسیەکی تەنگەتیلکە بەدیهێنراوە، کە ناخۆشیەکی توش ببێ دەکاتە هاوارو نالە نال، کە دەوڵەمەنیش دەبێ بەخەڵکی نابەخشێ، تەنها نوێژکەران نەبن.﴾[1].

بەڵام بڕوابون بەقەدەر وا لەمرۆڤ دەکات لەسەر یەك راستەڕێ گوزەر بکات، بەخۆشی هەڵنەفرێوێو لەخۆبایی نەبێو تەنگانەو ناخۆشیش نائومێدی نەکات، چونکە دەزانێ هەرچی خۆشیو ناخۆشیو بەهرەو تەنگانەیە لەلای خوداوەیەو بەزیرەکیو تەگبیری خۆی وەدەستی نەکەوتوە،

---

١ المعارج: ١٩-٢٢.

﴿وما بِكُمْ مِـــنْ نِعْمَـــةٍ فمِـــنَ اللّـــهِ: هـەر بەهرەیـەکتان هـەبێ هـەموی لـەلای خواوەیە﴾[1]. بۆیە وەکو قارونی لێنایەت و لەخۆی بایی نابێو کەش و فشان ناکا بەهۆی ئەو گەنجینەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیبو:

﴿ إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لاَ تَفْـــرَحْ إِنَّ اللَّـــهَ لاَ يُحِبُّ الْفَرِحِينَ، وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الآخِرَةَ وَلاَ تَنسَ نَصِيبَـــكَ مِـــنْ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلاَ تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الأَرْضِ إِنَّ اللَّـــهَ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ، قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِنـدِي: قارون لـەهۆزی موسا بـو بەلام ستەمی لەوان کرد، ئەوەندەمان ماڵ و گەنجینـە پـێدابو کەهـەڵگرتنی هـەر گەنجینەیەکی بۆ دەستەیەکی بەهێزیش سـەخت بـو، کاتـێ هۆزەکـەی پێیـان گوت: هەڵمـەفرێوێ چونکە خـودا شـادیکەرانی سەرمەست و مـەغروری خـۆش ناوێت، لـەوەی خـوا پێـی داوی خۆشـی ئاخیرەتی پـێ بەدەسـت بێنـەو بەشـی گوزەرانی دنیاشت لەبیر مەکە، چاکە بکە وەکو خـودا چاکـەی لەگـەڵدا کـردویو خراپکاری لەسەر زەوی مەنێوە، خودا خراپکارانی خۆش ناوێ. گوتـی: نـەخێر بەسای زانستی خۆم پەیدام کردوە﴾[2].

جا ئەگەر بڕوادار توشی ناخۆشیو مەینەتیەکیش بێ، دڵساردو هیوابڕ نابێ بەڵکو ئارام دەگرێ و چارەڕێی پاداشت دەکات، چونکە سوڕ دەزانێ بەتەقدیری خوا رویداوەو مایـەی تاقیکردنەوەیـە، بـەڵێ بـەم جـۆرە بڕوایـە رەزامـەندی و دڵارامی وەدەست دێنێ.

﴿ مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْـلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ، لِكَيْلاَ تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ تَفْرَحُوا بِمَا آتَـــاكُمْ:

---

[1] النحل ٥٣

[2] القصص ٧٦-٧٨

هەر بەڵایەك لەزەوی‌و لەخۆتاندا روی دابێ بەرلەوەی کە بیخوڵقێنین لە لەوحی مەحفوزدا نوسیومانە، بەراستی ئەمە بۆ خوا ئاسانە، تا بەڵکو بۆ شتە لەدەست چوەکانتان خەفەتبار نەبن و فریو نەخۆن بەو شتانەی دێتە دەستتان.﴾[1] ..

خودا بەبەندەکانیدا هەڵگوتوەو دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ: ئەوانەی کە لەگەڵ توشی بەڵاو بەسەرهاتی خراپ دەبن دەڵێن ئێمە هەر ئی خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئەوانە رەحمەت و بەزەیی خوایان بۆ دێت، ئەوانە رێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر﴾.[2]

**٣- ئەوەی بڕوای بەقەدەر هەیە هەردەم وریایە:**

بڕوادار بەقەدەر هەمیشە وریایە، چونکە خودا دەفەرموێ:

﴿ ..فَلاَ يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ: کەس لەنەخشەو پیلانی خوا دڵنیا نابێت مەگەر دۆڕاوەکان﴾[3].

دڵان بەردەوام لەگۆڕان دان و دڵەکانیش لەنێوان دو پەنجەی خوای میهرەبانیش دان و چۆنێکی بوێ رویان وەردەگێڕێ ئەو فیتنەو ئاژاوانەش کە تیری خۆیان ئاڕاستەی دڵی مرۆڤ دەکەن گەلێك زۆرن، بۆیە بڕوادار هەمو دەم وریایە نەبادا لە دین وەرگەڕێ، یان ئاخرو ئۆخری کردەوەکانی بەخراپەکاری بڕێتەوە، ئەمەش نابێتە مایەی تەمبەڵی‌و ساردوسڕیی، بەپێچەوانەوە دەبێتە پاڵنانی کردوکۆششی بەردەوام و ئەنجامدانی چاکەی زۆرو دورەپەرێز بون لەگوناحان.

---

١ الحديد ٢٢_٢٣

٢ البقرة ١٥٦-١٥٧.

٣ الأعراف ٩٩

٤- بەدڵێکی سەقامگرتو بەرەنگاری تەنگانەو ئەستەمیەکان دەبێتەوە:

ئەگەر یەکێك بڕوای وابێ هەرچی توشی دەبێ لەژیانیدا لەلای خودا نوسراوەو بڕوای وابێ بژێویو تەمەن بەدەست خوایە، بێباکانەو بەدڵێکی پڕ لە ورەوە ڕوبەڕوی ناڕەحەتی و کارەساتەکان دەبێتەوە.

هەر ئەو بڕوایەش بو ورەی وەبەر موجاهیدان ناو بوە پاڵنەری ئەوپەڕی مەردایەتیان، هی وایان هەبو کام شوێن مەترسی مردنی لێدەکرا بێ سێودو لێکردن هورژومی بۆ دەکرد، کەچی کە رزگاری دەبو و پاشان لەسەر جێگا دەمرد، دەگریا لەخەمی ئەوەی لەشەڕدا شەهید نەبوە.

ئەم بڕوایە بو سەقامی وەبەر دڵی پیاوچاکان ناو بەوپەڕی ئازایەتیو چاونەترسیەوە لەروی ستەمگەرو یاخیکاران هەڵگەڕانەوە، بێ ئەوەی لەپێناو خوای گەورە لەلۆمەی لۆمەکاران بترسن، چونکە دەیانزانی هەمو کارو کردەوەیەك بەدەست خوایەو چیان بۆ تەقدیر کرابێ، هەر ئەوە رودەدات.

لەوە نەدەترسان ئەگەر لەروی ستەمکاراندا قسەی هەق بلێن بژێویان لێ ببڕێ، چونکە دەیانزانی بژێوی بەدەست خوایەو ئەگەر خوا بڕیاری دابێ هیچ کەسێك ناتوانێ ببێتە لەمپەر، ئەگەر بڕیاریشی نەدابێ هیچ کەسێك ناتوانێ بیگەیەنێ.



# سەرچاوەکان


١) الأعتقاد والهداية الى سبيل الرشاد، دار الآفاق الجديدة-بيروت. الأولى ١٤٠١هـ-١٩٨١م.

٢) جامع الأصول لإبن اثير. تحقيق شعيب الأرناؤوط. مكتبة الحلواني وآخرون. ١٣٩٢هـ- ١٩٧٢م.

٣) سنن أبي داود. تحقيق محمد محيي الدين عبدالحميد. المكتبة التجارية- القاهرة.

٤) سنن الترمذي. دار إحياء التراث العربي- بيروت.

٥) شرح أصول اعتقاد اهل السنة والجماعة. لأبي القاسم هبة الله بن الحسين الطبري اللالكائي. دار طيبة- الرياض.

٦) شرح العقيدة. المكتب الإسلامي -بيروت. الرابعة ١٣٩١هـ.

٧) شرح النووي على صحيح مسلم المطبعة المصرية ومكتبتها. القاهرة.

٨) الشريعة للآجرى. دار الكتب العلمية -بيروت. الأولى ١٤٠٣هـ-١٩٨٣م

٩) شفاء العليل لإبن القيم. دار الكتاب العربي -مصر.

١٠) صحيح البخاري. اعتمدت على متن فتح الباري. طبعة السلفية.

١١) صحيح الجامع الصغير. تحقيق محمد ناصرالدين الألباني. المكتب الأسلامي -بيروت.

١٢) صحيح سنن الترمذي للشيخ ناصرالدين الألباني. مكتب التربية العربي. الرياض. الأولى ١٤٠٨هـ-١٩٨٨م.

١٣) صحيح مسلم. تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي. دار إحياء التراث. بيروت، الثانية ١٩٧٢م.

١٤) العقيدة الطحاوية. شرح وتعليق الشيخ ناصرالدين الألباني. المكتب الإسلامي، بيروت الأولى ١٣٩٨هـ- ١٩٧٨م.

١٥) فتح الباري لإبن حجر. طبعة السلفية -القاهرة.

١٦) الفرق بين الفرق لعبدالقاهر بن طاهر الأسفرايني. دار المعرفة، بيروت.

١٧) القاموس المحيط لفيروز الآبادي. مؤسسة الرسالة، بيروت، الأولى ١٤٠٦هـ.

١٨) لوامع الأنوار البهية، للسفاريتي. دولة قطر.

١٩) النهاية في غريب الحديث لإبن الأثير. المكتبة العلمية، بيروت.

٢٠) مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيمية. جمع ابن قاسم. طبع دولة المملكة العربية السعودية.

٢١) مشكاة المصابيح. للخطيب التبريزي. بتحقيق الشيخ محمد ناصرالدين الألباني. المكتب الإسلامي. بيروت ١٣٨٣هـ-١٩٦٢م.

٢٢) معارج القبول بشرح سلم الوصول الى علم الأصول في توحيد لأحمد حافظ حكمي. مطبوعات الرئاسة العلمية لإدارات البحوث-الرياض.

٢٣) معالم السنن للخطابي على مختصر سنن أبي داود للمنذري. مطبة السنة المحمدية. ١٣٦٩هـ-١٩٥٠م

٢٤) المفردات في غريب القرآن للراغب الأصفهاني. تحقيق محمد سيد كيلاني. شركة مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي،مصر. ١٣٨١هـ-١٩٦١م

٢٥) الملل والنحل للشهرستاني. دار المعرفة، بيروت. الثانية. ١٣٩٥هـ-١٩٧٥م.

# فەرهەنگۆك

| ئەلف | |
|---|---|
| ئاتاج | پێویست، موحتاج. |
| ئاسەوار | شوێنەوار. |
| ئاكام | ئەنجام، ئەجەل. |
| ئەدگار | نیشانە، رەنگ و رو، سەروسیما، ملامح. |
| ئامـاژە | هێما، ئیشارە. |
| ئاوەر | باوەڕ و دڵنیایی، یەقین. |
| ئاوەز | هۆش و فام، عەقڵ. |
| ئافەریدەكردن | خەڵقكردن، خوڵقاندن، ئەفراندن. |
| ئافەریدگار | خوای خالق. |
| ئەرێونەرێكردن | وەسوەسە گرتن. |
| ئەركبار | مكلَف |
| ئەستەم | زەحمەت و سەختی، دژوار. |
| ئەستون | كۆڵەكە، الركن. |
| ئەفسوس | داخ و خەفەت، حەسرەت. |
| ئەژنەوا | گوێبیست، گوێڕایەڵ، مطیع. |
| ئەنگیزە | الباعث، الدافع. |
| ئەفراندن | ئافەریدەكردن. |

| ب | |
|---|---|
| باب | باوك. |
| باگۆدانەوە | بەرپەرچ دانەوە، وەڵامدانەوەیەكی توند، الردّ. |
| بەرانگژبونەوە | بەرەنگاربونەوە، التحدّي |
| بەدبەخت | كڵۆڵ، چارەڕەش، الشقي. |
| بەرتوان | ممكن. |

## ب

| | |
|---|---|
| بەرهـــــەراو | بەرفرەوان، بەرگوشاد. |
| بـــــــەهرە | سود، کەڵك، نیعمەت. |
| بـــــــەند | الفصل. |
| بـــــــەرباد | بەربا. |
| بەڵگـــەخوازی | الاستدلال. |
| بـــــــزر | ون، گوم. |
| بـــــــزاڤ | بزوتنەوە، الحركة. |
| بژێـــــوی | رزق و رۆزی. |
| بنـــــــەڕەت | الاصل. |
| بـــــــوار | دەرفەت، المجال. |
| بێنیـــــاز | الغني. |
| بێـــــهودە | بێسود. |
| بیـــــــانو | هەنجەت، الحجة. |
| بێخـــــەوش | بێعەیب. |
| بێگـــــاری | کاری بەزۆری، السخرة. |

## پ

| | |
|---|---|
| پاکیگـــــاری | پاکیکردن، التسبیح. |
| پارســــەنگ | ئەو برە قورساییەیە کە بۆ یەسکان کردنی دو تای تەرازو دەخرێتە سەر تایەکی تەرازوەکە. |
| پاســـاودانەوە | مەهانە دۆزینەوە بۆ بەرەوا بینینی کارێك، التعلیل. |
| پـــــــەروا | ترس. |
| پەشـــــێوی | شپرزەیی و ناڕێکوپێکی. |
| پـــــەیرەوی | شوێنکەوتنی بەرتامەیەك یان کەسێك. |
| پـــــەرژەنگ | ناخۆشیو تەنگانەی کارەسات ئامێز، الهول. |
| پـــــــەتا | نەخۆشیەکی لێکدی گرەوە. |

## پ

| | |
|---|---|
| پەزمەندە | پاشەکەوت، زەخیرە. |
| پەی پێبردن | تێگەیشتن، الادراك. |
| پێز | هێزو کێش، بەرەکەت. |
| پێودانگ | ڕێوشوێن و دەستور. |
| پێشبین | کەسێك قسە لە روداوان دەکا بەر لەوەی رو بدەن، الکاهن. |
| پێشەنگ | پێشڕەو، القدوة. |
| پێوانەکاری | القیاس. |
| پێشێل | پێخوست. |
| پۆزش | تەوازۆ، عوزر. |
| پشتیوانەکان | الانصار. |
| پێکان | لەنیشانە دان، الإصابة. |

## ت

| | |
|---|---|
| تارومار | تەفروتونا، تێك و پێك. |
| تەختی پارێزراو | اللوح المحفوظ. |
| تەرم | جەنازە. |
| تەما | هومێد، الرجاء. |
| تەقەلا | هەوڵ، کردوکۆش. |
| تەگبیر | راوێژ، نەخشەکێشان بۆ کارێك، التدبیر. |
| تەوانا | القادر. |
| تەخشان و پەخشان | پەرش و بڵاوکردنەوە. |
| تفاق | زەخیرە. |
| تێشو | بژێوی سەفەر. |
| تێکرایی | الاجمالي. |
| تێبەریکردن | المبالغة. |
| توژینەوە | الدراسة، البحث. |

## ت

| | |
|---|---|
| توێژەر | الباحث. |
| تۆکمە | شتی ناوپڕی قایم. |
| توێژ | چین، الشريحة. |
| توخن کەوتن | ئیلاقەکردن، نزیک بونەوە |

## ج

| | |
|---|---|
| جحێڵ | گەنج. |
| جوغز | بازنە. |
| جمە | شەپۆلی قەرەباڵغی. |
| جێباس | المبحث. |

## چ

| | |
|---|---|
| چەمك | المفهوم. |
| چمك | سوچ، قولینچك. |
| چیلکەدار | داروکەی زۆر باریکی کورت. |
| چین | توێژ. |

## خ

| | |
|---|---|
| خامۆش بون | کپ بون، کوژانەوەی ئاگر. |
| خەملاندن | قەرساندن، ئەندازەگرتن، التقدير. |
| خۆشبەخت | بەختیار، السعيد. |
| خوازگە | المطلب. |
| خورتی | تۆبزی، زۆری. |

| | |
|---|---|
| **د** | |
| داڕژات | (داڕژێ!) بۆ سەرکۆنەو بەسوکگرتن بەکاردێ. |
| داکۆکی | پشتیوانی، لاگیری. |
| داخوازی | المقتضی. |
| دەرەتان | دەربازگە، ڕێگەی ڕزگار بون. |
| دەنا | ئەگینا، ئەگەرنا، وإلاّ. |
| دەستەوسان | مەحتەل ماو، العجز. |
| دەسبەرداربون | وازهێنان، الأستغناء. |
| دەمودەست | دەستبەجێ، فوراً |
| دەمەوەری | زمان درێژی، زۆر بلێیی. |
| دەرفەت | هەل، فرسەت. |
| دەربوار | دەرەتان، ڕێی دەربازبون. |
| دزێو | ناشرین. |
| دێرین | کۆن، القدَمْ. |
| دوڕیان | سەری دو ڕێگە کە دەگەن بەیەك، مەفرەق. |
| **ر** | |
| ڕانواندن | نیشاندان، العرض. |
| ڕاورەو | المذهب. |
| ڕاداشتن | ئامارژە، ئیشارەتدان. |
| ڕاپەرمون | تێڕادیتن. |
| ڕابون | هەڵسانەوە، قیامەت. |
| ڕەگاژۆ | ڕەگ داکوتاو. |
| ڕەمەکیانە | عشوائي. |
| ڕەها | مطلق. |
| ڕەشۆکی | خەڵکی ڕەمەکی، عەوام. |
| ڕەخ | لا |

## ر

| | |
|---|---|
| رەشــــــکەوتن | إلتباس. |
| رمـــــــوزن | بلّح و رەزاقورسی ناشیرین. |
| ریّخـــــــــت | سروشت، الفطرة. |
| ریّنویّنـــــــی | الهدایة. |
| ریّوشـــــــویّن | دەستوری کار. النهج. |
| ریسمان بــەئاسمان گـــــــەیاندن | ئیدیۆمیّکه بۆ مەحالّیّتی دەگوتریّ. |
| ریّـــــــژەو | برشت و پیّز، الثمرة، بەروبوم و بەرهەم. |

## ز

| | |
|---|---|
| زانایانی پاشین | الخَلَف. |
| زانایانی پیّشین | السلف. |
| زگ | سك. |

## ژ

| | |
|---|---|
| ژیّــــــدەر | سەرچاوە. |
| ژیـــــوان | پەشیمان، التائب، المنیب. |

## س

| | |
|---|---|
| سالۆزی | خۆ لەگیّلیدان، خۆلیّ نەبان کردن، التجاهل. |
| سەبارەت | هۆ، السبب. |
| سەرسەخت | کەللەرەق. |
| سەرەنگریّ | رەت بردە، هەڵەنگوتە. |
| سەرمەشق | نمونە بۆفیّرکردن، اسوة. |
| سەرزەنشت | سەرکۆنە، لۆمە. |

## س

| | |
|---|---|
| سەرتاپا | سەر تا بن. |
| سەقامگیر | جێگیر، چەسپاو، خۆڕاگر. |
| سوڕ | بەتەئکید. |
| بۆسێودو | بێدودڵی |
| سیخورمە | بەمشت لێدان. |
| سرەوتن | ئۆقرە گرتن. |

## ش

| | |
|---|---|
| شەکەتی | ماندوبونی بڕست بڕ. |
| شنینەوە | لەرین لەبەر با. |
| شوێنپایە | المقام. |
| شوێنکەوتوان | التابعین |

## ع

| | |
|---|---|
| عەوداڵ | شەیدا |

## ف

| | |
|---|---|
| فەراهەم هێنان | رەخساندن، التهیئة. |
| فراژوبون | گەشەکردن. |

## ق

| | |
|---|---|
| قەرە | شان. |
| قیچ | کەمێك، تۆزێك، بڕێك. |
| قرپۆك | بێنرخ و پوچ |

## ك

| | |
|---|---|
| كاوێژكردنـەوە | جوینەوە. |
| كەشم و نەشـم | نازو عیشوە، دەعیەلێدان. |
| كەمایەسـی | كەموكورتی. |
| كۆمـەك | یارمەتی. |
| كۆمـەكخوازی | یارمەتخوازی، الأستعانة. |
| كۆچـەران | المهاجرون. |
| كیـژ | كچ. |

## گ

| | |
|---|---|
| گازاندە | گلەیی. |
| گەواهی | شاهیدی. |
| گەمارۆدان | دەورەگرتن. |
| گەندەڵ | رزیو. |
| گشتگیر | هەموەكی، الشامل. |
| گوشاد | فرەوان. |
| گومرا | الضالّ. |
| گیرخواردن | گرفتار بون. |
| گێركە | مێرولەی بچوك. |

## ل

| | |
|---|---|
| لارێ | منحرف. |
| لەبارداهەبون | توانین لە كردنی كارێكدا. |
| لەخۆرا | لەخۆیەوە، من تلقاء نفسه. |
| لەمپەر | رێگر، بەربەست، المانع. |
| لەرزۆك | یەكێك ئەندامێكی توشی لەرزین ببێ. |
| لەكۆڵكردنەوە | براندنەوە، لادانی بەلایەك. |

## م

| | |
|---|---|
| مامۆتك | دەمڕاست، عاقڵ و هۆشمەند. |
| ماتەم | خەفەتباری. |
| مەحاڵ | موستەحیل. |
| متەق | قسە، ورتە. |
| مشتومڕ | موناقەشە. |
| مکوڕ | سوور، ڕشت، مصرّ. |

## ن

| | |
|---|---|
| ناوبەد | ناوزڕاو. |
| ناواخن | ناوەوەی شت. |
| ناقۆڵا | ناڕێك و بڵح. |
| ناساز | نەگونجاو. |
| ناتەوانا | العاجز. |
| ناسناو | اللقب. |
| ناکۆك | ناتەبا. |
| نەساز | نەگونجاو. |
| نەڕێوێژ | ئەو کەسانەی شت ناسەلمێنن. |
| نەنگی | عەیب. |
| نشێوی | لێژی. |
| نقوجڕ | نیخەنیخ لەبەر زەحمەتی بارکردنی شتی گران. |
| نکوڵی | نەسەلماندن، ئینکاری. |
| نۆژەن | نوێ، تازە، المحدث، الجدید. |

## و

| | |
|---|---|
| ویست | ئیرادە، ڤان. |
| وێناکردن | التصویر. |

| ھ | |
|---|---|
| هـــــاوێرکردن | جیاکردنەوە. |
| هـــــاودژ | النقیض. |
| هاموشـــــۆ | هاتوچۆ. |
| هـــــاوچون | وەك یەك، الشبیه. |
| هەتـــەرکردن | هەڵەکردن، نەپێکان. |
| هـــــەمبێز | ئامێز. |
| هـــــەدا | السکینة. |
| هـــــەرمێن | ڕەواج. |
| هـــــەموگر | الشامل. |
| هـــــەژمار | حیساب. |
| هـــــزر | فیکر. |

| ی | |
|---|---|
| یـــــارانی<br>رێیـــــازو<br>کۆمـــــەڵ | اهل السنة والجماعة. |